لێنینگراد بە تایبەتی بە یارمەتی ئا. ئا. فریمەن و ئی. ئا. ئۆربێلی هەنگاوێکی گەورە بۆ لە پێشخستنی کوردناسیدا بە گشتی و وەرگرتنی شێوەیەکی ڕاست و شێوازێکی زانستی لە لێکۆڵینەوەی مەسەلەی کوردناسیدا .

لە نێوان ئەو لێکۆڵینەوانەی سەبارەت بە زمانی کوردی لە یەکێتی سۆڤێت نوسراون ، کاری ئەم زانایانە : حاجی جندی ، ئا . خاچاتۆریان ، ق. کوردۆ ( کوردۆیێف ) ، ئی. ئی. تسوکەرمان ، چ. بەکۆ ( باکایێف ) ، یو . یو . ئاڤالیانی ... بەناوبانگن .

لە ساڵی ۱۹۳۲ دا ئا . خاچاتۆریان کتێبێکی ڕێزمانی کوردی بە ئەرمەنی و کوردی لە چاپ دا[٤٨] . ناتەواوی گەورەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە دەستوری زمانی ئەرمەنی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە . هەروەها نوسەر لەسەر بناغەی نوسراوەکانی ( جاردین و یوستی و بییدار ... هتد ) ئەم ڕێزمانەی نوسیوە ، بێ ئەوەی سود لە زمانی گفتوگۆی کوردی وەربگرێ ، ئەمەش بووە بە هۆی سەرنەکەوتنی کارەکەی .

لە ساڵی ۱۹۲۵ لە یەریڤان ئا . خاچاتۆریان و حاجی جندی بۆ قوتابخانە ناوەندییەکان کتێبێکی ڕێزمانی کوردییان دانا[٤٩] .

(٤٨) ئا . خاچاتۆریان ، زمانتامەی کرمانجی ، یەریڤان ۱۹۳۲ ( بە زمانی کوردی و ئەرمەنی ) .

(٤٩) ئا . خاچاتۆریان و حاجی جندی ، زمانتامە ژا کرمانجی ، یەریڤان ۱۹۲۵ ( بە زمانی کوردی ) .

ئەم کتێبە ، هەر وەك ئەوەی پێشتر ناتەواوی ئێجگار زۆر بوو ، وە زۆر لەو کەم و کورتیانەی لە کتێبی ڕێزمانی توسەرانی زۆردا هەبوون دووبارە کراونەتەوە . لەگەڵ هەموو ئەو کەم و کورتیانەشدا ، ڕێزمانەکەی ئـا. خاچاتۆریان و حاجی جندی « دەورێکی گەورەی بینیوە لە پێشکەوتنی ڕۆشنبیری کوردی ئەرمەنستاندا »[٥٠] . هەروەها نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە « دانەرانی ئەم ڕێزمانە لە چوونیێتی داڕشتنی بنچینەی ڕێزمانی زمانی کوردیدا بۆ قوتابخانە کوردیەکان هیچ ڕێزەوێکی پێشتر لەبەر دەستیاندا نەبووە تا سوودی لێ وەربگرن »[٥١] .

لە مەیدانی کوردناسیدا بە گشتی و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا بە تایبەتی ، مامۆستا قەناتی کوردۆ خزمەتێکی گەورە و شایانی کردوە و گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبی دەربارەی زمانی کوردی ـ واتە نووسینی ڕێزمانی کوردی (تیۆری و پراکتیك) ، لێکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبی ، بەراوردکردنی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خوارو ، دانانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕووسی و ئەو بابەتانە .

ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشرێت ئەوەیە کە وا مامۆستا قەناتی کوردۆ ساڵی ١٩٤٩ کتێبێکی ڕێزمانی

---

(٥٠) ئی . ئی . تسوکرمان ، ڕێزمانی زمانی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ ، ل ١٥ .

(٥١) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥ .

کوردیی لە چاپ دا[52] و ساڵی ١٩٥٧یش بە زمانی ڕووسی کتێبێکی تری هەر لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[53]. گرنگی ئەم دوو کتێبی ڕێزمانە تەنها لەوەدا نییە کە بۆ یەکەم جار لە سۆڤێت و لە مێژووی کوردناسیدا لە سەر شێوەیەکی زانستی کتێب دەربارەی زمانی کوردیی بڵاوبکرێتەوە، بەڵکو سەرەڕای ئەوەش توانرا لەم دوو کتێبەدا گەلێك کاری ئاڵۆز و ناڕاشکرا لە ڕێگایەکی زانستییەوە خاوبکرێتەوە و ئاشکرا بکرێ، وەك: دۆزینەوەی نێر و مێ و دابەشکردنی ناو بە سەریاندا؛ خاوکردنەوەی هەندێ ئاڵۆزی لە ڕەگی کردار و لە پێشگر و پاشگردا؛ شێوەی کرداری (متعدی transitive) لە کاتی ڕابوردوودا؛ هەروەها گەلێك مەسەلەی گرنگی تر کە تا دەرچوونی ئەم دوو بەرهەمەی مامۆستا کوردۆ باش لێیان نەکۆڵرابووەوە.

هەرچەندە ئەو دوو کتێبی ڕێزمانە کە لە سەر شێوەیەکی زانستی و کەرەستەیەکی فراوان نوسراون و کەم و کورتییان زۆر کەمە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر جارێك کە لە چاپ دەدرێنەوە دانەرەکەیان گەلێك فراوانتریان دەکات و بە شێوەیەکی جوانتر و ڕاستتر دایان دەڕێژێتەوە، لەبەر ئەوە چاپی یەکەی «ڕێزمانی زمانی کوردیی»، کە لە ساڵی ١٩٤٩دا دەرچووە گەلێك جیاوازی لەگەڵ

---

(٥٢) ق. کوردۆ، ڕێزمانی زمانی کوردیی، (بە زمانی کوردیی)، چاپی یەکەم، یەریڤان ١٩٤٩.

(٥٣) ق. کوردۆ، ڕێزمانی زمانی کوردیی، (بە زمانی ڕووسی)، مۆسکۆ ١٩٥٧.

چاپی چوارەمیدا هەیە(٥٤). ئەو چوار چاپەی ئەو کتێبە کە بە زمانی کوردی دەرچوون دەورێکی گەورەیان لە ناو قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنســتانی سۆڤێتدا بینیوە. مامۆســتایانی زمانی کوردی ئەو قوتابخانانە زۆر بایەخیان داوە بە کتێبەکانی ق. کوردۆ، بەتایبەتی چونکە بە شێوەیەکی ئاسان و رەوان نوسراون.

هەرچەندە زوربەی لێکۆڵینەوەکانی ناوەرۆکی ئـەو کتێبانەی ق کوردۆ دەربارەی (فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و سـینتکسیس)ن، کە گرنگترین بەشن لە لێکۆڵینەوەی زماندا، بەلام لە هەمان کاتدا مامۆستا لە چۆنێتی دروست بوون و دارشتنی وشە «اشتقاق، تکوین الـکلمات Word - Building »یشـەوە کەلێك وتاری نوسیوە، وەك: «دروست بونی کرداری بارگران لە زمانی کوردیدا»(٥٥)؛ «دروست بونی وشە لە زمانی کوردیدا»(٥٦)؛ «مانا و فرمانی پاشگری ـ ك ـ (ەکە) لە زمانی کوردیدا»(٥٧)، «پێشگر و پاشــگر لە زمانی

---

(٥٤) کتێبی «رێزمانی زمانی کوردی»، کە بە زمانی کوردی نوسراوە و لە ســالی ١٩٤٩دا لە یەریڤان لە چاپ دراوە، تاکو ئێســتا چوار جار ـ واتــە لە ســالانی ١٩٤٩ و ١٩٥٦ و ١٩٦٠ و ١٩٧٠دا لە چاپ دراوەتەوە.

(٥٥) کورتەی نامەی دوکتۆری مامۆستا کوردۆ، لینینگراد ١٩٤١.

(٥٦) بڕوانە کتێبی «رێزمان و مێژوی زمانەکانی رۆژهەلات»، مۆسکۆ ـ لینینگراد ١٩٥٨، ل ١٠٩ ـ ١٤٢.

(٥٧) بڕوانە کتێبی «لێکۆڵینەوە لە مێژوی کولتوری گەلانی رۆژهەلات»، بۆ بیرەوەری ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیلی، مۆسکۆ ـ لینینگراد ١٩٦٠، ل ٣٦١ ـ ٣٦٨.

کوردیدا »[٥٨] .... هتد. لەم وتارانەدا هەمو ئەو ڕێگایانە دیارکراون کە لە زمانی کوردیدا وشەیان پێ دروست دەکرێت. ناوەڕۆکی ئەم وتارانە بە شێوەیەکی کورت و پێویست لە چاپی چوارەمی کتێبی «ڕێزمانی زمانی کوردی »دا بڵاوکراونەتەوە.

پاش ئــەوەی ق. کوردۆ دەربارەی ڕێزمانی زمانی کوردی گەلێك وتار و نامیلـکە و کتێبی بڵاوکردەوە، ئنجا لە ســـالانی پەنجادا دەستیکرد بە دانانی فەرهەنگێـکی کوردی (دیالێکتی کرمانجی ژوروو) — ڕوسی و ساڵی ١٩٦٠ ئەم فەرهەنـگە کە بەرهەمی ڕەنجی چەند سـاڵەی بو لە چاپ درا[٥٩]. ژمارەی وشە کوردییەکانی ئەم فەرهەنـگە (٣٤) هەزار وشەیەکە کە لە وەرگێڕانی و لێـکدانەوەیاندا کوردۆ هونەرێـکی بەرزی نواندوە. بە زمانێـکی ڕەوان و پاراو، بە وشەی پڕ بە پێستی خۆی شەرحی وشـــەکانی کردوە. هەروەها پێویستە سـەرنج بۆ ئەوەش ڕابکێشین کە وا لە پەنجا و حەوت لاپەڕەی کۆتایی فەرهەنـگەکەیـــدا بە کورتی لە ڕێزمانی زمانی کوردی دواوە.

ق. کوردۆ تا ساڵی ١٩٥٠ تەنها بە لێـکۆڵینەوەی دیالێـکتی کرمانجی ژووروەوە خەریك بـو، بەڵام لە پاش ســـالی ١٩٥٠وە کەوتە فێربونـــ و لێـکۆڵینەوەی دیالێـکتی کرمانجی خواروش و ئەمەش زیاتر یارمەتی دا کە بتـــوانێ قوڵتر لە زمانی کوردی

---

(٥٨) بڕوانە کتێبی «کورتەی دەنگوباســی ئامۆزگای گەلانی ئاســیا»، ١٩٦٣، ژ ٩٧، ل ٣٢ ـ ٣٣.

(٥٩) ق کوردۆ، فەرهەنـگی کوردی ـ ڕوسی، مۆسکۆ ١٩٦٠.

بکۆڵیتەوە . ئەوە بۆ لە ماوەیەکی کورتدا توانی گەلێك لێکۆڵینەوە دەربارەی بەراوردکردنی زێزمانی هەردوو دیالێکتی کوردی (کرمانجی ژوورو و خواروو) بڵاوبکاتەوە ، وەك : « دەربارەی زێزمانی زمانی کوردی »[٦٠] ؛ « تصریفی کرداری (متعدی transitive) لە زمانی کوردیدا » (لەبەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خواروو)[٦١] ؛ « جێناوی لکاو (enclitic) لە زمانی کوردیدا »[٦٢]...

وە لە ساڵی ١٩٦٥ دا کتێبێکی لە چاپ دا لە ژێر ناوی « بەراوردکردنی زێزمانی دیالێکتەکانی کوردی » (کرمانجی ژوورو و خواروو)[٦٣] کە بریتییە لە نامەی دوکتۆرێکەی کە دەتوانرێ بە یەکەمین لێکۆڵینەوە لە مەسەلەی بەراوردکردنی دیالێکتەکانی کوردی دابنرێت ، ئەویش نەك تەنها لەبەر ئەوەی لەم ڕووەوە لێکۆڵینەوە زۆر کەمە ، بەڵکو لەبەر ئەوەش کە تاکو ئێستا هیچ کوردناسێکی تر نەیتوانیوە بەو شێوە زانستییە لەو باسە گرنگە

---

(٦٠) ق. کوردۆ ، دەربارەی زێزمانی زمانی کوردی ، (بە زمانی ڕوسی) ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

(٦١) بڕوانە کتێبی « وتاری نوێنەرانی سۆڤێت لە کۆنگرەی بیست و چوارەمی ڕۆژهەلاتناسیدا » ، مۆسکۆ ١٩٦٠ ، ل ٩ .

(٦٢) بڕوانە کتێبی « نووسراوە دێرینەکان و مەسەلەی مێژووی کولتووری گەلانی ڕۆژهەلات » ، لینینگراد ١٩٦٥ ، ل ٥٦ ـ ٥٧ .

(٦٣) ق. کوردۆ ، بەراوردکردنی زێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ، (کرمانجی ژوورو و خواروو) ، مۆسکۆ ١٩٦٥ ، ٨١ ل (کورتەی نامەی دوکتۆری) .

کۆڵینەوە و ئەوەندە کەرەستە بە شێوەیەکی وا ڕاست و گونجاو بەکار بهێنێ .

مەبەســـتە هەرە گرنـگەکانی ئەم بەرهەمە زانستییەی کوردۆ بریتین لە دەرخستنی یەکێتی و وێکچوونی دیالێکتەکانی زمانی کوردی و دیارکردنی هۆ مێژوویییەکانی ئەو جیــاوازییە کەمانەی لە نێوانیاندا هەن لەگەڵ نیشـانـدانی ڕادەی دەوڵەمەندی و پێشکەوتنی ئەم زمانە .

وەك وتمان ئەم کتێبە کورتەی نامەی دوکتۆرێکەیەتی ، وە هەر لەبەر ئەوەشە کە گشت سوچێکی زمانی کوردی نەگرتـۆتەوە ، بەڵام لە ساڵی ١٩٦٨دا لە نوسینی نامەی دوکتۆرێکەی بـوەوە و شەهادەی دوکتۆری علومی وەرگرت . نامەی دوکتۆرێکەی نزیکەی (٦٠٠) لاپەڕە دەبێ و ئێستا لە ژێر چاپدایە . بێگومان وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە زانستییە گرنگە بۆ سەر زمانی کوردی کارێکی پێویستە ، چونکە لەو باوەڕەداین یارمەتی شـارەزایانی کورد بـدات بـــۆ چارەسەر کردنی گەلێك لەو گیر و گرفتانەی لە ڕێگای زمانەکەماندا هەن .

قەناتی کوردۆ تەنها بە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە خەریك نەبوە ، بەڵکو گـەلێك بەرهەمی زانستیشی لە بارەی ئـــەدەب و فۆلکلۆر و مێژووی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە ، کە بەداخـەوە لێـرەدا توانای ئەوە نییە لە هەمووی بدوێین(٦٤) .

---

(٦٤) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سەبارەت بە کارە زانستییەکانی قەناتی کوردۆ ، بڕوانە : ئەو زنجیرە وتارەی کە نوسەری ئەم نامیلکەیە لە=

هەروەها ئی. ئی. تسوکەرمان کە لە بەشی کوردیی ئامۆزگای ڕۆژهەلاتناسیی لێنینگرادە ، خزمەتێکی باشی زمانی کوردیی کردوە و ژمارەیەکی زۆر لە وتار و نامیلکە و کتێبی لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسیوە . ئەوەی لە ناویاندا جێگای بەرز و دیاری وەرگرتبێ « ڕێزمانی زمانی کوردیی »یە کە لە سالی ١٩٦٢دا لە چاپ دراوە(٦٥) . ئەم نوسراوەی کە بریتییە لە (٢٤٠) لاپەڕە ، دەربارەی کردارە لە دیالێکتی کرمانجی ژوروودا . بەمە و گەلێك کاری زانستیی تر لە مەسەلەی مۆرفۆلۆژیادا(٦٦) گەلێك کێشەی ئالۆز و گرنگی ڕێزمانی زمانی کوردیی خاوکردۆتەوە .

چەرکەزی بەکۆ (باکاییف) کە کوردی سۆڤێتە لە ئامۆزگای زمانەوانی مۆسکۆ کار دەکات . ئەم زانایەش خاوەنی گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبە . زوربەی نوسینەکانی سەبارەت بە بەشە دیالێکتی کوردی سۆڤێتە . لە کارە زانستێکانیدا ، بە تایبەتی فەرهەنگی

---

زمارە ٤٦ و ٤٧ و ٤٨ ی سالی ١٩٧٣ ی ڕۆژنامەی « برایەتی » دا لە ژێر ناوی « کوردۆ - کورد و کوردپەروەر و کوردناس » دا بلاوی کردۆتەوە .

(٦٥) ئی. ئی. تسوکەرمان ، ڕێزمانی زمانی کوردیی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

(٦٦) بە وێنە : « وشەی سەرکب لە زمانی کوردیدا » (لە کتێبی : وتاری زانایانی ئامۆزگای زمانەوانی ، لینینگراد ١٩٦٣) ؛ « نیشانەی کۆ لە دیالێکتی کرمانجی ژوروودا » (فیلۆلۆژیای ئێرانی ، مۆسکۆ ١٩٦٩) ...

« کوردی ـ ڕوسی »[67] و کتێبی « زمانی کوردەکانی ئازربایجان »[68] دیارن .

شایانی باسە باکایێف خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ ڕوسییە کە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر چاپ کراوە . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە ( ١٤ ) هەزار وشەی کوردی و ( ٦١٨ ) لاپەڕە . لە پاشکۆی ئەم نوسـراوەدا ( ل ٥٠٩ ـ ٦١٨ ) کورتەیەکی ڕێزمانی کوردی داوە . هەرچەندە لەم کارەدا گەلێک ناتەواوی هەیە ، وەك شێواندنی بەشە کوردییەکەی بە وشەی ڕوسی کە بە هیچ جۆرێك لە زمانی کوردیدا بەکار ناهێنرێن ، یاخود کەم و کورتی لە شـەرح و لێکدانەوەی مانای هەندێ وشەدا ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگەیەکی دیاری لە کوردناسی سۆڤێتدا هەیە .

کتێبی « زمانی کوردەکانی ئازربایجان »ەکەی بریتییە لە ( ٢٨٤ ) لاپەڕە . بە شێوازێکی زانستی و فراوان لە فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی و سینتکیس کۆڵیوەتەوە . نوسەر لەم کتێبەدا سەرکەوتووە و هەندێ مەسەلەی زمانەوانی خاوکردۆتەوە و ئەنجامی بەکەڵکی داوە .

هەروەها چەند مانگێك لەمەوبەر باکایێف لە ژێر نـاوی « زمانی کوردەکانی سـۆڤێتدا » کتێبێکی بەنرخ و ڕازاوەی بڵاوکردەوە[69] باکایێف لەم نوسـراوەدا لە ئەنجامی بەراوردکردنی

---

(٦٧) چ خ باکایێف ، فەرهەنگی کوردی ـ ڕوسی ، مۆسکۆ ١٩٥٧ .

(٦٨) چ. خ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ .

(٦٩) چ. خ. باکایێف ، زمانی کوردەکانی سۆڤێت ، مۆسکۆ ١٩٧٣ .

بەشە دیالێکتەکانی کوردەکانی سۆڤێتدا گەلێك شتی نوێی لە ڕێزمانی کوردیدا دۆزیوەتەوە .

یو. یو. ئاڤالیاتی کە زۆر کەس هێشتا ناوی نەبیستوە خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی کردووە . ئەم ئافرەتە لە کۆتایی سالآنی ٣٠ دا لەگەڵ ق. کوردۆ و ئی. ئی. تسوکەرماندا شاگردی ئا. ئا. فرێیمەن بووە و لە سالّی ١٩٤٠دا بڕوانامەی دوکتۆرای وەرگرتووە و نامەکەی لەسەر « جێناو لە زمانی کوردیدا » بووە . ئەم زانایە ئێستا پرۆفیسۆری زانکۆی سەمەرقەندە . کارە زانستییەکانی (وتار و نامیلکە) کە دەربارەی زمانی کوردی نوسیویێتی ژمارەیان دەگاتە (١٥) ، وە لێکۆڵینەوەکانی شێوازێکی زانستی و واقعی تەواویان هەیە :

جگە لە مامۆستایان (ئا. خاچاتۆریان ، حاجتی جندی ، ق. کوردۆ ، ئی. ئی. تسوکەرمان ، چ. خ باکائێیف ، یو. یو. ئاڤالیاتی) ، هەروەها مامۆستایان (کەریمی ئەیوبی ، ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، زارێ یوسوپۆڤا ، مەکسیمی خامۆ... ش) گەلێك وتار و کتێبی زانستی بەنرخیان لە بارەی زمانی کوردییەوە بلآوکردۆتەوە .

کەریمی ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا جگە لە چەند وتارێکی بەنرخ ، خاوەنی کتێبی « دیالێکتی کوردی موکری »ن[٧٠] ، کە

---

(٧٠) ك. ر. ئەیوبی و ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ١٩٦٨ .

دەنگێکی باشی لە کوردناسی سۆڤێتدا داوەتەوە ، بە تایبەتی چونکە نوسەرانی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زانستی و ڕاست لە ڕێزمانی کوردی کۆڵیونەتەوە و بە بیری من ئەم کتێبە پێویستە بکۆڕێتە سەر زمانی کوردی .

مەکسیمی خامۆ کە لە بەشی کوردی زانکۆی یەریڤانە لە بارەی زمانی کوردییەوە چەند وتار و نامیلکەی بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « ڕەخنە لە کتێبەکەی ج. خ باکاییف (شێوەی کوردی تورکمەنستان) »(٧١) ، « مۆرفۆلۆژی شێوەی بادینان »(٧٢) .... (زاری یوسوپۆڤا)ش کە لە بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی لێنینگرادە لەم ڕووەوە درێغی نەکردوە و بەرهەمی زانستی خۆی بڵاوکردۆتەوە .

بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشەی باسەکەم بێنم حەزدەکەم سەرنجیش بۆ ئەوە ڕابکێشم کە وا لە لێکۆڵینەوەی کورد و زمانی کوردیدا ئەکادێمی ئی. ئا. ئۆربێلی دەورێکی تایبەتی هەیە . ئەم زانایە لە یەکێتی سۆڤێت بناغەی کوردناسی دانا و بە فەرمانی ئەو بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی لێنینگراد کرایەوە . لەگەڵ ئەوەی ئۆربێلی بەگشتی زۆر بە کاروباری کارگێڕی و مەسەلەی زمانەوانییەوە خەریك بوە ، بەلام جار و بار لە زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە و لە ناو دەستنوسەکانیدا هەندێ لێکۆڵینەوەی لە سەر

---

(٧١) بڕوانە : گۆڤاری « مێژو و فیلۆلۆژی » ، یەریڤان ١٩٦٥ ، ژ ٣ .

(٧٢) بڕوانە : « کورتەی نامەی دوکتۆری » یەریڤان ١٩٦٥ .

زمانی کوردی ئەرمەنستان هەیە . هەروەها خاوەنی فەرهەنگێکی کوردی – ڕۆسی یە کە بەداخەوە مەرگ نەیهێشت بە چاپی بگەیەنێ . ئێستا ئەم فەرهەنگە لە ژێر چاودێری کارگێڕانی بەشی کوردی ئامۆژگای ڕۆژهەلاتناسی لێنینگرادا ئامادە کراوە و نێرراوە بۆ چاپ .

## لە ئەوروپا :

(ل. و. فۆسسوم)ی میسیۆنێری ئەمەریکی ساڵی ۱۹۱۹ لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە کتێبێکی بڵاوکردەوە[۷۳]. نوسەر ئەم کتێبەی لەسەر بەشە دیالێکتی موکری داناوە و بە تایبەتی لە مۆرفۆلۆژی دواوە ، بەڵام بەداخەوە لە لێکۆڵینەوەکەیدا گرنگی بە خاسیەتی ناوخۆی زمانی کوردی نەداوە و هاتوە دەستوری زمانی ئنگلیزی بەکار هێناوە و ئەمەش بوە بە هۆی ناتەواوی و کەم و کورتی .

ساڵی ۱۹۲۲ ر. ف. جاردین لە بەغدا ، بە زمانی ئنگلیزی کتێبێکی لەسەر ڕێزمانی کوردی بڵاوکردەوە[۷٤] . کەرەستەی ئەم

---

(۷۳) L. O. Fossum, Practical Kurdish Grammar, Minneapolis, 1919.

(۷٤) R. F. Jardine, Bahdinan Kurmanji, Baghdad, 1922.

کتێبە زاری کرمانجی ناوچەی بادینانە و بریتییە لە : مۆرفۆلۆژی (ل ۲ ـ ٤١) ، سینتکسیس (ل ٤١ ـ ٤٤) ، وشە دارشتن (ل ٤٤ ـ ٥٢) ، فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئنگلیزی (ل ٥٥ ـ ١١٤) .

جاردین هەرچەندە لە هەمو لایەکی باسەکە نەکۆڵیوەتەوە و زۆر شتی هەر بە کورتی بڕیوەتەوە ، بەڵام کتێبەکەی بە یەکێك لەو کارە هەرە سەرکەوتوانە دادەنرێت کە لە بارەی رێزمانی کوردییەوە دانرابێت و کەرەستەکەی زاری کرمانجی ناوچەی موسڵ بێت . جاردین بە شێوەیەکی زانستانە و ورد بۆ گەلێك لە کێشە گەورەکانی رێزمانی کوردی چوە ، بەڵام بە داخەوە لە هەندێکی تریاندا بە هەڵە چوە .

لە ساڵی ١٩٢٦ دا لە پاریس پاول بیدار دەربارەی شێوەی موسڵ کتێبێکی بچوکی رێزمانی زمانی کوردی بڵاوکردەوە(٧٥) . لە لێکۆڵینەوەی رێزماندا نمونەی لە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردییەوە هێناوەتەوە . بەشێکی تایبەتی لە کتێبەکەی بۆ هەندێ وێکچون و نزیکی وشە و دەستوری زمانی کوردی ـ فەرەنسی تەرخان کردوە . سەبارەت بە جوانی و دەوڵەمەندی زمانی کوردی نوسیویەتی : « زمانی کوردی یەکێکە لە زمانە هەرە شیرینەکان . زمانێکی خۆش و بە ئاواز و رەوان و دەوڵەمەند و فراوانە ، فێربونی ئاسانە . ئەم زمانە سەرنج و دڵ رادەکێشێ ... »(٧٦) .

---

P. Beidar , Grammaire Kurde , Paris , 1926 . (٧٥)

(٧٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢٧ .

له پاش دەرچوونی ڕێزمانەکەی پاول بیدار لە کوردناسی ئەوروپادا بۆ ماوەیەك هەست بە ستی و بێ بەرهەمی دەکرێت و تا ئەم ساڵانەی دوایی لەم بارەیەوە هیچ شتێکی وەها بڵاونەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت . ئەوەی کە لە ماوەی ئەم ١٥ ساڵەی دوایشدا هاتبێتە کایەوە ، تەنها نووسراوەکانی ( ئەرنست مەکاریۆس و د. ن. ماکەنزی ) ن.

لە ساڵی ١٩٥٨دا لە شاری نیویۆرك ئەرنست مەکاریۆس کتێبێکی ڕێزمانی کوردی (شێوەی سلیمانی) لە چاپ دا[٧٧] . ئەم کتێبە پێکهاتووە لە : پێشەکی — کە دەربارەی زمانی کوردی و لێکۆڵینەوەی دواوە ( ل ٣ ـ ٥ ) ؛ کورتەیەك دەربارەی نووسینی کوردی بە پیتی عەرەبی (ل ٦ ـ ١٢) ؛ فۆنێتیك (ل ١٣ ـ ١٤) ، مۆرفۆلۆژی (ل ١٥ ـ ٨٢) ؛ وشە دارشتن (ل ٨٢ ـ ٩١) ، سینتکیس (ل ٩٢ ـ ١٠٦) . لە پاشکۆی کتێبەکەیدا (ل ١٠٩ ـ ١٢٠) ناوی ئەو سەرچاوانەی تۆمار کردوە کە دەربارەی زمانی کوردی هەن ، وە لە (ل ١٢٧ ـ ١٣٨ )دا فەرهەنگۆکێکی کوردی ـ ئنگلیزی بڵاوکردۆتەوە .

ساڵی ١٩٦١یش د. ن ماکەنزی کتێبێکی لە بارەی ڕێزمانی کوردییەوە بڵاوکردەوە[٧٨] ، کە پێکهاتووە لە دوو بەشی سەربەخۆ .

---

(٧٧) Ernest N. Mccarus, A. Kurdish Grammar, New york, 1958.

(٧٨) D. N. Mackenzie, Kurdish Dialect Studies, London, 1961.

بەشی یەکەم ـ دەربارەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارون ، بەشی دووەم ـ بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی ژوورون . نووسەر لە لێکۆڵینەوەی بەشە دیالێکتەکانی کرمانجی خوارودا هەر بەشە دیالێکتێکی ناو ناوە دیالێکت و ناوەکەشی بە زاراوی جوگرافی ناوە ، وەك : سلێمانی ، وارماوە ، بنگرد ، پشدەر ، موکری ، هەولێر ، ڕەواندوز ، خۆشناو . بە نیسبەت کرمانجی ژوورووشەوە عەینی شتی کردووە : سورچی ، ئاکری ، ئامێدی ، بامەرنی ، زاخۆ ، شێخان . لە لێکۆڵینەوەی دیالێکتی کرمانجی خوارودا بە زۆری شێوەی سلێمانی ، وە بۆ کرمانجی ژوورو شێوەی ئاکریی بەکار هێناوە .

بەشی لێکۆڵینەوە لە هەر دیالێکتێك دابەش دەکات بەسەر دوو فەسڵدا — فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی . لە فەسڵی فۆنێتیکی دیالێکتی کرمانجی خوارودا لە شێوەی سلێمانی کۆڵیوەتەوە ، وە بۆ بەشە دیالێکتەکانی تر تەنها باسی ئەو جیاوازییانەی کردوە کە لەگەڵ بەشە دیالێکتی سلێمانیدا هەیانە . هەروەها بۆ دیالێکتی کرمانجی ژوورو لە شێوەی ئاکری کۆڵیوەتەوە ، وە بۆ بەشە دیالێکتەکانی تر تەنها باسی ئەو جیاوازییانەی کردووە کە لەگەڵ بەشە دیالێکتی ئاکریدا هەیانە .

لە بەشی فۆنێتیکدا بۆ دیالێکتی کرمانجی خوارو — (٩) و بۆ کرمانجی ژوورو — (٨) دەنگی بزوێن ( Vowels ) ی دیارکردوە و

به شێوه‌یه‌کی زانستی له‌و مه‌سه‌له‌یه کۆڵیوه‌ته‌وه[٧٩] . ئه‌وه‌ی که‌م و کورتیش بێت ئه‌وه‌یه که لێك جیاکردنه‌وه‌ی کورتی و درێژی ده‌نگه بزوێنه‌کانی نه‌سه‌لماندوه .

به شێوه‌یه‌کی فراوان له مۆرفۆلۆژی دواوه و به تایبه‌تی بایه‌خی به کردار داوه (ل ٨٤ — ١٢٩) ، (١٧٧ — ١٩٦) .

بێشك ئه‌م نوسراوه‌ی د. ن ماکه‌نزی کارێکی گرنگ و گه‌وره‌یه ، به‌ڵام یه‌کێك له ناته‌واوییه‌کانی ئه‌وه‌یه که نوسه‌ر ئه‌و جیاوازییه که‌مانه‌ی له نیوان شێوه‌ی گفتوگۆی شاره‌کانی بادیناندا هه‌ن ده‌یانکات به به‌ڵگه بۆ دابه‌ش کردنی شێوه‌ی ئه‌و ناوچه‌یه به سه‌ر چه‌ند به‌شه دیالێکتێکدا له ڕاستیدا ئه‌و جیاوازییانه ئه‌وه‌نده نین که شایانی باس بن ، وه ئاشکرایه که بۆچی له کوردناسیدا شێوه‌ی شاره‌کانی ئاکرێ و ئامێدی و بامه‌ڕنی و زاخۆ .. به به‌شه دیالێکتی بادینان به ناوبانگن . به زۆری له‌به‌ر ئه‌وه‌یه که زۆر لێك نزیکن و پێکه‌وه به‌ستراون ، نه‌ك دوورن و جیاوازن ، وه‌ك د. ن. مه‌که‌نزی په‌نجه‌ی بۆ ڕاکێشاوه . هه‌روه‌ها هه‌ندێ باوه‌ڕی هه‌ڵه‌ی به‌رامبه‌ر به زاراوی « زازا » و « کرمانجی » .... ده‌ربڕیوه که دوورن له واقعه‌وه .

پاش تێپه‌ر بوونی پێنج ساڵ د. ن. مه‌که‌نزی له باره‌ی زمانی کوردییه‌وه (زاری هه‌ورامی) کتێبێکی نوێی بلاوکردوه[٨٠] . له‌م

(٧٩) هه‌مان سه‌رچاوه ، ل ١ ، ٣٠ .

(٨٠) D. N. Mackenize, The Dialect of Awraman, London, 1966.

کتێبەدا ئەوەی کە دوکتۆر مەکەنزی باسی کردبێ ئەمەیە :

فۆنێتیك ـ لێرەدا لە دەنگەکانی شێوەی هەورامـی دواوە و (٢٩) دەنگی کۆنســۆنانت و (١) ی بزوێنی دیارکردوە ، وە لە جەدوەلی تایبەتیدا شێوە و جۆری دەربڕینیانی نیشان داوە .

مۆرفۆلۆژی ـ لەم بەشەدا بە زۆری باسی پێشگر و پاشگر و جێناوی لـکاو و تصریفی کردار . . . ی کردوە .

سـینتـکسیس ـ بە شێوەیەکی سا کار لە ڕســتە و وەرگێڕانی بۆ ئنـگلیزی دواوە .

جگە لەو باسانەی سەرەوە ، نەخشەیەکی هەورامانیشی کێشاوە و زوربەی دێهاتەکانی هەورامانی تۆمار کردوە .

هەرچەندە لەم نوسراوەدا چەند ناتەواوییەك دەبینرێ ، وەك : هەست نەکردن بە چۆنێتی دروست بوّن و شێوەی دەربڕینی هەندێ دەنگی بزوێن ، لە بەشی سینتکسیسدا جۆرەکانی ڕســتەی نیشان نەداوە ... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێـکی سەرکەوتووە .

* * * * * *

# ئەنجـــــام

لەبەر ڕۆشنایی ئـــەم باســـە کورتەدا ، کە دەربارەی مێژوی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییە ، ئاشـــکرا دەبێ و دەردەکەوێ کە زوربەی ئەو کارانەی لە بابەت زمانی کوردییەوە (ڕێزمان و دیالێکت و فەرهەنگ ....) بەر لە شەڕی یەکەمی جیهـان نوسراون سـەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوروو ، بە تایبەتی کارەکانی : م. گـارزۆنی ، ی. بیریزین ، پ. لێرخ ، ف. میـــوللەر ، ئا. ژابا ، س. ری ، ف. یوستی ، ئا. ســـۆتسین ، س. یەگیزارۆف پ. بییدار ، .... وە بەشێکی کەمتر سەبارەت بە کرمانجی خواروو ، وەك : ئا. خۆدسکۆ ، ئو. مان ، ه. شیندلەر ....

کەم و کورتی هەرە گەورەی هەندێ لەو نوسراوانە ، وەك : م. گـارزۆنی ، ی. بیریزین ، ئا. سۆتسین ، ئو. مان ، ف. میوللەر ، پ. بییدار .... لەوەدایە کە بـــە تەواوی باســـی هەمو لقەکانی مۆرفۆلۆژییان نەکردوە ، یاخود جاری وا هەیە سەرانسەر لقی گرنگ پەڕێنراوە ، هەروەها حالاتی دەســتوری زمانی کوردی بە ڕاست و ڕەوانی باس نەکراوە .

هەندێ نوسـەر ، وەك : ف. یوسـتی ، ی ســـۆن ، ل. فۆسسوم ، ی. بیریزین ، ف. میوللەر ، ئـــا. ســـۆتسین . . . لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ڕێگایەکی چەوتیان گرتووە ، ئەویش

ئەوەیە کە دەستووری زمانە ئێرانیێکانی تریان بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندوە .

هەروەها بەم باسەدا دەردەکەوێ کە لەبەر چەند هۆیەکی ئاشکرا ، بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە ڕووسیا و ڕۆژئاوادا بە مەسەلەی کوردناسی بەگشتی و زمانی کوردی بە تایبەتی گرنگی دراوە . بەڵام سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە شێوەیەکی عادیلانە و بە مەبەستێکی پیرۆز کارێکی ئێجگار گەورەی هەبوو لە پێشکەوتن و پەرەسەندن و گەشەکردن و سەرکەوتنی کوردناسیدا و توانی بیگەیەنێتە ئەو ڕادەیەی ئەمڕۆی کە لە بارەی زمان و ئەدەب و مێژوو و ئەتنۆگرافیا ... ی کوردەوە ژمارەیەکی بێشومار و جوان و پوخت و نایاب کاری زانستی بنووسرێ . بەداخەوە لە ڕۆژئاواشدا پاش شەڕی یەکەمی جیهان هەست بە سستی و بێ بەرهەمی دەکرێت و تا ئەم ساڵانەی دوایی لە بارەی زمانی کوردییەوە شتێکی وەها بڵاونەکراوەتەوە کە شایانی باس بێت ، ئەوەی کە لە ماوەی ئەم ١٥ ساڵەی دواییشدا هانبێتە کایەوە ، تەنها نووسراوەکانی ( ئەرنست مەکاربۆس و د. ن. ماکەنزی ) ن.

هەرچەندە لە بارەی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان لە کوردستان هیچ شتێکی وەها نەبوە کە شایانی باس بێت ، بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە سەرنجی بۆ ڕابکێشین ئەوەتە کە لە ماوەی ئەم ٤٠ ـ ٥٠ ساڵەی دواییدا چەند هۆیەکی ئاشکرا کارێکی وەهایان کرد کە کوردستان ( بە تایبەتی کوردستانی

عیراق ) ببێتە مەڵبەندی ئەم بزوتنەوە نوێیە لە مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا .

وەك ئاشکرایە لە زوربەی ئەو لێکۆڵینەوانەی دەربارەی زمانی کوردی نوسراون کەم و کورتی و ناتەواوی زۆرە و هەرچەندە زۆر مەسەلەی زمانەوانی کوردی کەم یاخود هەر باس نەکراون ، بەلام بنکەیەك پێکهاتووە و دروست بوە و کەرەستەیەکی وەها کۆکراوەتەوە کە لەو رێگایەوە دەتوانرێ گەلێك لێکۆڵینەوەی نوێ و عیلمی بنوسرێ و لەو رێگەیەوە بکەینە گەلێك ئەنجامی بەکەڵك .

* * * *

# ناوەرۆك

لابەڕە

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد

# وشەی زمانی کوردی

دوکتۆر

ئەوڕەحمانی حاجی مارف

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد - بەغدا

١٩٧٥

# پێشەکی

کاتێ باسی زمان دێتە گۆڕێ ، بەر لە هەمو شتێك مەبەست وشەیە . بێ زانینی وشـــە ، بە تایبەتی وشەیەکی زۆر ، زمان نازانرێ و ئاخاوتنی پێ ناکرێ . ئەمە لە کاتی فێربوونی زمانی بێگانەدا بەئاشکرا دەردەکەوێ . ئەگەر کەسێك لە دەنگەکان و ڕێزمانی زمانێکدا شارەزاییی باش پەیدا کردبێ ، بەڵام وشەی کەم لەبەر بێ و موفرەدات کەم بزانێ ، ئەوە ئەو کەسە بە هیچ جۆرێك ناتوانێ باش لەو زمانـــە بگا و باش پێی بخوێنێتـــەوە و وتووێژی پێ بکا . بێگومان ، تەنیا زانینی موفرەدات و پشتگوێ خستنی تێکڕای دەنگەکان و پێکهاتنی ڕێزمانیش ، هەروەها مەودای باش زانینی زمان تەسك دەکەنەوە ، چونکە یەککرتنی ئەو سێ ڕیشـــەیە ، ( وشـەکانی زمان ، دەنگەکان ، پێکهاتنی ڕێزمانی ) ، زمان سازدەکەن و پێكدەهێنن . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، دەبێ ئەو ڕاستییە لە بیر نەکەین ، کە وا زانینی ژمارەیەکی زۆر لە وشـــە و زانینی بەکارهێنانیان ڕادەی زانینی زمان نیشان دەدەن . جا هەر لەبەر ئەوەشە ، وشە بە ڕیشەیەکی هەرە گرنگی زمان دەژمێررێت

زانینی ژمارەیەکی زۆر لە وشـە و بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی راست ، نەك تەنیا لە فێربوونی زمانی بێگانەدا گرنگە ، بەڵـکو بۆ زمانی زگماکیش ـ بۆ ئەو زمانەی لە منداڵییەوە وتوویژی پێ دەکەین ـ گەلێك پێویستە . راست نییە ، ئەگەر وا بیر بکەینەوە ، هەمتو ئەو کەسـانەی بە کوردی دەدوێن و ئەو خەڵـکەی کە زمانی کوردی زمانی زگمـاکیانە ، وەك یەك دەیزانن و ئاخاوتنیان وێکدەچێ و یەك جۆر وشـە بەکار دەهێنن ، بەڵـکو پلەی زانینی ئادەمیزاد جیـــاوازە . وەك ئاشکرایە ، ئەمەش لە گەلێك رووەوە پەیوەندی بە رادەی کولتووری مرۆڤەوە هەیە .

هۆی ئەو جیاوازییە چییە !

جیاوازی پلەی خوێندەواری و جۆری ژیان و توانا و هەروەها پەیوەندی جیـاواز لەگەڵ زماندا دەور دەبینێ . وەرگرتن و هەزم کردنی وشەی زمانی زگماك ، تا رادەیەك لە خۆڕا و بە شـێوەیەکی میکانیکی و بێ بیرکردنەوە روودەدات . مرۆڤ وشەی زمانەکەی هەر لە منداڵییەوە بێ بیرکردنەوە ، لە کەسانی دەور و پشتی وەردەگرێ . بەڵام لەگەڵ ئەو بیر نەکردنەوەیەشدا لە وەرگرتنی وشەی زمانەکەیدا ( کە هـــەر لە منداڵییەوە دەست پێ دەکا و لە تێـکڕای ژیانیدا بەردەوامە ) چالاکی هەزم و وەرگرتن و ئارەزوو دەورێـکی گەورە دەبینن . جا لەبـەر ئەوەیە ، ئـەو کەســـانەی شێوەی ژیانیان وێکدەچـــێ و رادەی خوێندەوارییـــان وەك یەکە ، جیـاوازی لە ئاخاوتنیاندا هەیە . هەندێـکیان بە زمانێـکی وشك و رەق ، وە

له کاری لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا کەلێنێکی گەورەیە. بینینی ئەو کەلێنە هەستی جولاندم و رایکێشام کە خۆم بەو باسەوە خەریك و ماندوو بکەم ... دوای هەوڵ و کۆششێکی زۆر، ئەوەی بۆم کرا کردم و ئەوەی لە تواناما بۆ بەجێم هێنا ... هیچ گومانم لەوەدا نییە، کە ئەم کارەی من تەواو نییە و کەم و کورتی تێدایە. بەڵام ئەوەی شایانی باس بێ، ئەوەیە کە ئەم کتێبە سەرەتایەکە لە بارەی کێشەی وشەی زمانی کوردییەوە و گەلێك کەرەستەی نوێی وەهای تێدایە، کە تا ئێستا لە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا باسیان نەکراوە.

ئەرکی سەرەکی ئەم کتێبە « وشەی زمانی کوردی »، تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەیە لەو کێشە گرنگانەی لە ڕووی لێکسیکۆلۆژی ( Lexicology )یەوە پەیوەندییان بە وشەی کوردییەوە هەیە، بە تایبەتی لە بارەی مانا و واتایانەوە؛ شوێنیان لە باسای گشتی زماندا؛ پەیدابوونیانەوە؛ بەکار هێنانیانەوە؛ دەرفەتی جێکردنەوەیانەوە لە ئاخاوتندا؛ جۆری دەربڕین و شێوەی چەسپاندنیان لە ڕەوانبێژیدا ... وەك ( جۆری وشە، جۆری مانا، پەیوەندی نیوان وشە، وشەی هاوبێژ، وشەی هاوواتا، وشەی دژواتا، وشەی یەکواتا، وشەی فرەواتا، وشەی تەواو، وشەی ناتەواو، وشەی بەرەڵڵا، وشەی گیراو، وشەی کوردی پەتی، وشەی ئێرانی، وشەی هند و ئەورووپایی، وشەی بێگانە لە زمانی کوردیدا، ڕەگی بێگانە لە موفرەداتی زمانی کوردیدا، زژەژێژ، موفرەداتی زمانی کوردی لە ڕووی چالاکی و سستییەوە، وشەی مردە، وشەی نوێباو،

فریْزی گیراو ، جۆری فریْزی گیراو ، فریْزی گیراو لە رۆی واتاوە ... هتد ) .

هەرچەندە ئەرکی ئەم لیٚکۆڵینەوانەش دەکەویٚتە سەر سێ بەشی هەرە گرنگی لیٚکسیکۆلۆژی : واتاناسـی ( علم معـاني الالفـاظ Semasiology ) ، ئیٚتیمۆلـۆژی ( الاتيمولوجيـا Etymology ) ، فریْزیۆلۆژی ( علم العبارات الاصطلاحية Phraseology ) . بەڵام کاری فەرهەنگنوسی ( Lexicography ) پەیوەندی راسـتەوخۆی بە کیٚشەی وشەوە هەیە . جا لەبەر ئەو هۆیەیە ، کە لە دوا بەشی ئەم کتیٚبەدا لە فەرهەنگ و جۆری فەرهەنگ و دەوری فەرهەنگ و کاری فەرهەنگ دواوین و باسی تیٚکڕای فەرهەنگە کوردییەکانمان کردوە ، کە لە کاری فەرهەنگنوسی و میٚژوی فەرهەنگنوسی کوردی و پاراستنی وشەی کوردی و لیٚکدانەوە و شیکردنەوەی هەندیٚ کیٚشەدا دەوریان بینیوە .

لیٚرەدا بە پیٚویستی دەزانم ، پەنجە بۆ ئەوە رابکیٚشم ، کە دۆ بەشی ئەم کتیٚبە ـ واتە واتاناسی و ئیٚتیمۆلۆژی ، وەك وتـار لە دۆ ژمارەی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »دا بڵاوکراونەتەوە[٢] . وە بەشیٚکی بەشی فەرهەنگنوسی بە زمانی عەرەبی لە ژمارەیەکی دیکەی هەمان گۆڤاردا چاپ کراوە[٣] . هەرچی پیٚشەکی و بەشی

---

(٢) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، ١٩٧٤ ، ل ٨١ ـ ١١٦ ؛ بەرگی سیٚیەم ، بەشی دووەم ، ١٩٧٥ ، ل ٢٠٧ ـ ٢٤٠

(٣) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی سیٚیەم ، بەشی یەکەم ، ١٩٧٥ ، ل ٧٠٥ ـ ٧٢٨ .

هەندێکیان بە زمانێکی شیرین و جوان و پاراو و دەوڵەمەند دەدوێن .

چۆن وشەکانی زمان بناسرێن ؟

ئێمە هەر لە منداڵییەوە ، لەگەڵ فێربوونی وشەکانی زماندا فێری ئەو یاسا و دەستورانەش دەبین ، کە وشەیان پێ دروست دەکرێ و دادەڕێژرێ . ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆش دەکا کە لەگەڵ وەرگرتنی لە خۆڕا و میکانیکی هەزاران وشەدا ، بتوانین بە بیر و هۆش لە زمان وردبینەوە و شتی شاراوەی ئاشکرا بکەین و فێری ئەوە ببین ، کە وەك چەکێکی پێویست بەکاری بهێنین .

زمان هەمیشە لەگەشە کردندایە و بە وشەی نوێ دەوڵەمەندتر دەبێ . ئاشکرایە ، کە بۆ ئەمە ، بە شێوەیەکی سەرەکی ، ئەو کەرەستەیە بەکار دەهێنرێ کە لەو زمانەدا هەیە . لە سەرێکەوە وشەی حازر بەدەست هەن ، وە لە سەرێکی دیکەوە کەرەستەی یاریدەر ، بە تایبەتی پێشگر و پاشگر . بەم جۆرە ، لەو وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەن ، وشەی نوێ دروست دەکرێن .

هەر کەسێك ، زمانی کوردی بزانێ ، بێ ئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ بکێشێ ، دەتوانێ چەندین وشەی نوێی وەها ناوبێنێ ، کە لەم چەرخەی ئێمەدا پەیدا بوون . لەم دەمەدا ، کە ژیانی ڕۆشنبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و سیاسی .... میللەتی کورد لە برەودایە و تێکڕای جیهان لە پێشکەوتندایە . بێگومان زمان پێویستی بە وشەی نوێ دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ وشەی نوێ پەیدا دەبێ .

بەهرەی بتوێنی زمان ـ نیشانەی بەختەوەری مەزنی ئادەمیزادە .
خۆش‌ویستنی زمانی زگماك و باش زانینی و چـــاك بەکارهێنانی ....
ئەرکی ســـەرشانی مرۆڤە و مایەی بەختیارییەتی . ناسین و زانینی
وشە و شارەزایی تێدا پەیدا کردنی کارێـکی بەرز و پێویستە .

لە نیوەی یەکەمی ســـەدەی نۆزدەمدا ، کاتێك زماننـاسی بە
زانستێـکی ســەربەخۆ دانرا ، زانایان گومانیان لەوەدا نەبو ، کە
بە تایبەتی وشە دانەیەکی سەرەکی زمانە . گەلێك لە زمانناسان لەم
بارەیەوە نوسیبیان و کۆڵیبیانەوە .

وەك ئاشکرایە ، پەردەی رەش بەسەر ســـەدان وشـەی
زمانەکەمانەوەیە و گەلێك روی گرنگی وشەی زمانی کوردی هێشتا
هەر بە ئاڵۆزی و تاریکی ماوەتەوە . هولی ئەمـەش ، ئەوەیە تاکو
ئێستا بەداخەوە لێکۆڵینەوەی قوڵ و زانستییانە دەربارەی وشـــەی
زمانی کوردی نەنوسراوە .

هەرچەندە بە گشتی لێکۆڵینەوە دەربارەی زمانی کوردی کەمە ،
بەڵام تـا رادەیەك باسی ( مۆرفۆلۆژی و فۆنەتیك و سینتاکس ) ـ
کە سێ بەشی گرنگن لە لێکۆڵینەوەی زمانـدا ـ کراوە . ئەوەی
سەرنج رابکێشێ ، ئەوەیە کە تا ئێستە چ زانایانی کورد و چ زانایانی
بێگانە لە بارەی ( لێکسیکۆلۆژی )[1] زمانی کوردییەوە شتێکی
ئەوتۆیان نەنوسیوە .

بێ‌گومان پشت گوێ خستنی کێشەی وشـەی زمانی کوردی

(١) شی‌کردنەوەی ئەم زاراوەیە و ئەوانی دیکە لە کتێبەکەدا هاتووە .

فرێزیۆلۆژی و بەشێکی کەی بەشی فەرهەنگ نووسی و فەرهەنگۆک و لیستەی سەرچاوەکان ، بۆ یەکەم جار بڵاودەکرێنەوە .

پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا هێمن موکریانی و مامۆستا شوکور مستەفا ، دوو مامۆستا و برای گەورە و هاوڕێی ئێزیکم دەکەم ، کە لە چیکردنەوەی گەلێک روی ئەم باسەدا ، زۆریان هاریکاری لەگەڵ کردم و یارمەتیان دام . سوپاسی برای دڵسۆزم کاک حسەین فەیزوڵڵا جاف دەکەم ، کە گەلێک سەرچاوەی نوێی و پێویستی بۆ دۆزیوەتەوە و نیشان داوم . بەگەرمی سوپاسی مامۆستا و برای گەورەم کاک محەمەدی مەلا کەریم دەکەم ، کە لە راست کردنەوەی هەڵەی چاپ و دەرکردنی ئەم کتێبەدا هاریکاری کردم هەروەها . رێز و سوپاسم بۆ کرێکاران و لێپرسراوی چاپخانەی کۆڕ ، کە بەراستی دڵسۆزانە ئەم کارەیان بۆ هەڵسووڕاندم .

تاقە هیوام ئەوەیە ، بەم کارە توانیبێتم خزمەتێکی بچووک پێشکەش بە زانیاری گەلەکەمان بکەم . لە بارەی « وشەی زمانی کوردی »یەوە پێم کرابێ چەند وشەیەکی بە کەڵک بنووسم و دوو قسەی خێر بکەم ...

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی (١)

لێکسیکۆلۆژی بەشێکە لە زانستی زمان و لە بارەی باری ئێستا و رابوردوی وشەوە دەدوێ . لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردی یاسای وتوویژی ئەمڕۆ و دوێنێ و شێوەی پەیدابون و پێشکەوتن و گەشەکردنی زمانەکەمان و پەیوەندی لەگەڵ مێژوی گەلی کوردمان بۆ دەردەخا و ڕوون دەکاتەوە .

کاکڵ و کەرەستەی لێکۆڵینەوەی لێکسیکۆلۆژی بەر لە هەمو شتێك وشەیە . وەك ئاشکرایە (مۆرفۆلۆژی) یش هـــەر لە وشە دەدوێ ، بەڵام لێرەدا دەیکاتە هۆ بۆ لێکۆڵینەوە لە دەستور و

(١) وشەی لێکسیکۆلۆژی Iexicology کە لە زمانی یۆنانییەوە وەرگیراوە ، پێکهاتووە لە : ( Iexikos ـ وشەکانی زمان ، وشەی فەرهەنگی ) و ( Iogos ـ زانست ) . بەم جۆرە وشەی لێکسیکۆلۆژی بە مانای ـ زانستی وشە ـ دێت .

ڕێزمان . کەچی لە لێکسیکۆلۆژیدا کاری پێویست و گرنگ زانین و ناسینی وشە و وشەکانی زمانە .

بە وینــە ئەگەر لە باری مۆرفۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژییەوە تەماشــای وشــەی « پاك » بکەین ، دەبینین ئەوەی کە بەلای مۆرفۆلۆژییەوە گرنگە ئەمەیە کە ئەم وشــەیە — ( ئاوەڵناوە Adjective ) ، ( ئاوەڵناوی سادەیە Adjective Simple ) ، لە ( پلەی بەراورد Comparative Degree ) دا دەبێ بە « پاکتر » و لە ( پلەی بالا Superlative Degree ) دا دەبێ بە « پاکترین » .... هتد . بەلام بە نیسبەت لێکسیکۆلۆژییەوە ، ئەوەی پەیوەندێ بە وشەی « پاك »ەوە هەبێت ، ئەوەیە کە ئەم وشــەیە لەگەڵ « پاقژ » و « پاکژ » و « خاوێن » دا هاوواتا ( Synonym ) یە و لە زۆر ناوچەی کوردستان بەکاری دەهێنن و لەگەڵ وشەی « پاك » — کە بە مانای « تێکڕا ، هەمو » دێت هاوبێژ ( Homonym )ە .... هتد .

هەروەها ئەگەر لە وشــەی « عەشق » وردبینەوە ، دەبینین ئەوەی بۆ مۆرفۆلۆژی گرنگ بێ ئــەمەیە کە ئەم وشــەیە ( ناو Noun) ، ( ناوی مەعنـــا Abstract Noun ) یە ...... وە بــۆ لێکسیکۆلۆژیش ئەمە گرنگە کە « عەشق » وشەیەکە لە مێژە کورد لە زمانی عەرەبییەوە وەری گرتووە ، ئەم وشەیە لەگەڵ « ئەڤین ، ئەوین ، دڵداری » دا هاوواتایە . ... وشەی « ئەڤین »یش وشەیەکی کوردی پەتییە و سـەر بە دیالێکتی کرمانجی ژوورووە و چەنــد

سالێکه له دیالێکتی کرمانجی خواروّدا جێگەی خۆی گرتووه و بووه به وشه‌یه‌کی ئه‌ده‌بی و له‌گه‌ڵ « ئه‌وین » و « عه‌شق » و « دڵداری » دا هاوواتایه ....

تاکو ئه‌م شوێنه تا راده‌یه‌ك ئه‌رك و گرنگی لێکسیکۆلۆژیان بۆ روّن بووه‌وه و به‌م جۆره ده‌توانین بڵێین که لێکسیکۆلۆژی له وشه و وشه‌کانی زمان ده‌کۆڵێته‌وه له باره‌ی :

١— مانا و واتایانه‌وه ؛

٢— شوێنیان له یاسای گشتی زماندا ؛

٣— په‌یدابوونیانه‌وه ؛

٤— به‌کار هێنانیانه‌وه ؛

٥— ده‌رفه‌تی جێکردنه‌وه‌یانه‌وه له ئاخاوتندا ؛

٦— جۆری ده‌ربرین و شێوه‌ی چه‌سپاندنیان له به‌لاغه‌دا .

ئه‌رکی ئه‌م لێکۆڵینه‌وانه‌ش ده‌که‌وێته سه‌ر سێ به‌شی هه‌ره گرنگی لێکسیکۆلۆژی که بریتین له :

واتاناسی (علم معانی الالفاظ Semasiology)[٢] و زانستی

---

(٢) واتاناسی Semasiology به‌شێکی سه‌ره‌کییه له زانستی وشه و له گشتی ئه‌و مه‌سه‌لانه ده‌کۆڵێته‌وه که په‌یوه‌ندییان به مانای وشه‌وه هه‌یه .

وشەداتاشین (عـلم الاشتقاق Etymology)[٣] و (عـــلم العبارات الاصطلاحیة Phraseology)[٤].

لەم سێ بەشە گرنگەی لێکسیکۆلۆژیدا دەتوانرێ تێکڕایی ئەو مەســـەلانەی پەیوەندییان بە وشە و وشەکانی زمانەوە هەیە شی بکرێنەوە . منیش لەم باســـەدا هـەوڵ دەدەم بەو پێیە لە لێکسیکۆلۆژی زمانی کوردیی بدوێم .

## واتاناسی SEMASIOLOGY

### وشـــە :

وشەکانی هەر زمانێك وەنەبێ تەنیا لە کۆمەڵێك وشە پێکهاتبن، بەڵکو بریتییە لە یاسـا و دەستورێـکی ورد و ئاشکرا و تەواو و رێك وپێك و دیاری کراو لە پەیوەندی و پەیوەستی راست و رەوداودا . لێکسیکۆلۆژی زانستی نییە کە لە بارەی وشـــەی جوێ جوێوە

---

(٣) ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانـی وشــە کە لە پەیدابوون و پێشکەوتنی وشە و ئەو دەورانەی پیایدا تێپەڕبوە دەدوێ .

(٤) لە یەکگرتنی هەندێ وشەدا مانای تایــەتی پەیدا دەبێ و بەم جۆرە وشە و دەستە واژانە دەڵێن فرازیۆلۆژی کە بەشێکە لە زانستی وشە .

بەدوێ ، بەڵکو زانستێکە دەربارەی سیستێم و دەستووری تێکرایی وشەکانی زمان

هەرچەندە لە وڵاتە پێشکەوتووەکان لە بارەی وشـەوە ، لێکۆڵینەوە زۆرە و لە گەلێك سوچەوە لەم مەسەلەیە وردبوونەتەوە و گەلێك زانا بەم کارەوە خەریك بوون و بەرهەمی بەنرخیان پێشکەش کردوە و ئەنجامی سـەرکەوتوویان وەدەست هێناوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا تەعریفی تەواوی وشـە نەکراوە و لەم بارەیەوە رایەکی یەکگرتوی وەها نییە کە گشت لایەك و تایبەتێتیەکی ئەم باسـەی گرتبێتەوە و هەموو زماناسان لایەنگیری بکەن .

ئەوەی لەم بارەیەوە پەیوەندی بە تەعریفی وشەوە هەبێت کە لە وڵاتی ئێمە نوسـراین ئەوەیە کە تا رادەیەك کاڵ و کرچن و تەنیا سوچێکی باسەکە دەگرنەوە(٥) .

---

(٥) بە وێنە :

مامۆستا سـەعید صدقی لە لاپەڕە ( ٦ )ی کتێبی « صرف و نحوی کوردی »دا ( بەغـدا ١٩٢٨ ) لە تەعریفی وشەدا دەڵێ : « تەنیا لفظێکە کە مەعنای ببێ ، وەکو ( پیـاو ، درەخت ، ئەسـتێرە ، بەرد ... ) » .

مامۆستا نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە ( ٩ )ی بەرگی دووەمی کتێبی « قواعدی زمانی کوردی »دا کە ساڵی ١٩٥٨ لە بەغدا بڵاوی کردۆتەوە ، لە تەعریفی وشەدا نوسیویتی : « ئـەو وشەیەیە کە لە=

ۆشك تەعریف و دیاری کردنی راست و زانستیانەی وشە ئەوەیە کە تیشك و رۆشنایی ئەو نیشانە سەرەکیانەی لە وشەدا هەن دەخۆیدا بنوێنێ. وشەش پێویستە ئەو خاسیەتە بنەرەتیانەی خوارەوەی تیدابێ :

---

= دەنگێ یا چەند دەنگێ پێك ئەهێنرێ و ئەوترێ و ئەنوسرێ ، وەك ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) ئەگەر بدرێنە دەم یەکتر ، وشەی ( خانزاد )ی لێ پێك دێ . وە وشەش دوو جۆرە : » . وە لە لاپەڕە ( ٢٢ )ی کتیبێ « ڕێزمانی کوردێ » شدا ( سلیمانی ١٩٦٠ ) لە بارەی وشەوە دەڵێ : « وشە کەرەسەی زمانە و لە دەنگێ وە یا چەند دەنگێ دروست ئەکرێ ، وەك وشەی ( خانزاد ) لە دەنگی ( خ ، آ ، ن ، ز ، آ ، د ) پێکهاتووە ، وشەش بە بۆی زۆر و کەمی وازەکانی دوو بابەتە » .

لە لاپەڕە ( ٣١ )ی بەرگی یەکەمی « فەرهەنگی خاڵ »دا ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە تەعریفی وشەدا نوسیوێتی : « وتە ( کلمة ) وشەیەکە کە مەبەستێکی ببێ ، وەك ( دار ، کار ، زن ، من ، بڕین ، دڕین ) » .

لە کتێبێ « زمان و ئەدەبی کوردێ » کە د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ و د. ئیحسان فوئاد و مامۆستا صادق بەهائەدین بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندێ دایان ناوە ( چاپی دووەم ، بەغدا ١٩٧٢ ) ، لە لاپەڕە ( ٢٠ )دا لە بارەی وشەوە نوسیویانە : « وشە ئەو بێژەیەیە کە رستەی لێ پێك دەهێنرێت » ، لە لاپەڕە (٢٨)یشدا دەڵێن : « وشە یا وازە لە چەند دەنگێك پێك دێ » .

١— پێکهاتنی فۆنێتیکی هەبێت ؛

٢— مانا و واتادار بێ .

٣— قەوارەی ڕێزمانی هەبێ .

٤— هەمیشە خاوەنی دەنگ و مانا بێت ؛

٥— هەردەم لە ئاخاوتندا وەك دانەیەك (وحدة) لە زمان بەکار بهێنرێ ؛

٦— پتر لە یەك گیرەی نەبێت ؛

٧— بتوانرێ لە ڕستەدا بەکار بهێنرێ ؛

٨— توانای هەبێ ببێت بە ئیدیۆم .

## جۆری وشــــه :

بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردیی ـ وەکو هەمو زمانەکانی سەر ئەم زەمینە ـ ئەو وشانەن کە مانای دیاردەیەکی (ظاهره) مەوزوعیی واقیعیی جۆراوجۆر دەبەخشن و بەم وشانەش دەڵێن وشـەی تەواو Autosemantic words . لە ڕوی مۆرفۆلۆژییەوە ئەم وشــانە بە زۆری (ناو و ئاوەڵناو و ژمارە و کردار و جێناو ...... ن) .

هەروەها پیۆیستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە هەندێ پۆل وشە، وەك (پیتی بانگهێشتن و وشەی یاریدەدەر .......) بە شیۆەیەکی ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە دیاردەی واقعییەوە نییە و مانایان شیۆەی تایبەتی

خۆی هەیە و هەر لەبەر ئەوەشە کە مۆرفۆلۆژی بە لێکۆڵینەوەی ئەم وشانە گرنگی دەدا و لێکسیکۆلۆژی تا رادەیەك دەیانخاتە پشت گوێ . لە زانستی وشەدا بەم چەشنە وشانە دەڵێن وشەی ناتەواو .

لە زمانی کوردیدا دوو جۆر وشەی تەواو هەن :

١— ئەو وشانەی لە شێوەی دروست بوون و دارشتنیاندا تا رادەیەك مانایان روون و ئاشکرایە (Motivated, having symbolic value) . ئەم وشانەش لە ئەنجامی وێکچوون و نزیکی (رەنگ ، شێوە ، ئەرك ، ئەندازە ، خاسیەت .... ی) دوو شتدا داتاشراون ، وەك :

شەکرشکێن — لە شێوەی دارشتنی ئەم وشەیەدا ئاشکرا دیارە کە ئامرازێکە شەکری پێ دەشکێنرێ .

سەوزە — هەموو جۆرە شینایییەك دەگرێتەوە کە روابێ . لە وشەی (سەوز)ەوە هاتووە کە جۆرە رەنگێکە ـ واتە لە وێچوونی (رەنگ)ەوە پەیدابووە .

٢— ئەو وشانەی کە پێکهاتن و شێوەی دروست بوونیان مانایان روون ناکەنەوە (Devoid of symbolic value) ـ واتە شێوەی دارشتنیان مانای ئاشکرا و دیار نیشان نادەن ، وەك :

داڵ — هەرچەندە ئاشکرایە کە (داڵ) مەلێکی گەورەی گۆشت خۆرە ، بەڵام شێوەی داڕشتنی مانای ڕوَن ناکاتەوە .

ترێ — ئاشکرایە کە بەری درەختی مێوە ، بەلام ئەم مانایە لە شێوەی داڕشتنی وشەکەدا دیار نییە .

بێشك هەر یەك لەم جۆرە وشانە مانای تەواوی خۆیان هەیە و بێ واتا نین . هەر وشەیەکیش یەك یاخود چەند مانایەکی هەیە ، ئەو وشانەی تەنیا یەك مانایان هەیەن لە لێکسیکۆلۆژیدا پێیان دەڵێن وشەی یەك واتا Monsemous word ، ئەو وشانەش کە مانایان زۆرە فرەواتا Polysemantic .

لە زمانی کوردیشدا ، وەکو هەموو زمانەکانی تر وشە هەن کە تەنها یەك مانایان هەیە و وشەش هەن کە مانایان زۆرە ، بۆ نمونە دەبینین کە هەندێ وشە ، وەك : ( شەو ، ئاشەوان ، دراوسێ ، ئەزنۆ ....... هتد ) لە یەك مانا زیاتریان نییە ، بەڵام وشەش هەن مانایان زۆرە و ئەو مانایانەش لە یەك نێزیکن ، وەك :

بەردانەوە — ١ـ بەردانی ئاوی گیراو ؛
٢ـ فڕێدانی شتێك لە بەرزییەوە .

جۆش‌سەندن — ١ـ هاتنە کوڵی شتی شل لەسەر ئاگر ؛
٢ـ بریتی‌یە لە تاوسەندنی جیهان لە هاویندا ؛
٣ـ گەرم بوونی یەکێك لە کارێکدا .

پوچ — ١ـ شتی بێ ناوکی بۆشی کاوڵ ،
٢ـ بریتی‌یە لە قسە و گفتوگۆی بێ‌هوودە[٦].

فرەواتایی بەشێکی زۆری وشەکانی زمانی کوردی ئەوە نیشان دەدات کە بەم زمانە دەتوانرێ باش تەعبیر بکرێت ، هەروەها شایانی باسە کە زوربەی ئەو وشانە بە رەسەن کوردین و لەناو جەرگەی کوردەواریدا هەڵقوڵاون .

جۆری مانا :

لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ دوو جۆر مانای وشەی جیا بکرێنەوە :

١— مانای حەقیقی direct ( proper ) meaning . بەو مانایە دەوترێ کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان دەدات .

---

(٦) لە هێنانەوەی هەندێ نموونە و شەرح کردنی وشەدا سوودم لە چەند فەرهەنگێکی کوردی ، بەتایبەتی فەرهەنگی خاڵ وەرگرتوە .

٢— ماناى مەجازى Transfered meaning . بەو مانایە دەوترێ کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان نادات ، بەڵکو لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ دیاردەیەکدا مانا دەدات .

بە وێنە وشەی « ئاگرنانەوە » لە زمانی کوردیدا بە ماناى (ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسوتێ) و (هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشوبنانەوە) دێت . ماناى یەکەمی ئەم وشەیە ـ ئاگربەردان بە شوێنێکەوە کە بسوتێ ـ کە مانایەکی حەقیقیە ئاشکرا دیارە کە راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان دەدات . بەڵام ماناى دووەمی کە ـ هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشوبنانەوە ـ یە مانایەکی مەجازییە و راستەوخۆ دیاردەیەکی مەوزوعی واقیعی نیشان نادات ، چونکە ئاشکرا دیارە کە لەم روداوەیاندا (گڕگرتن و سوتاندن)ی تێدا نییە ، بەڵکو ئەم کارە کە (ناخۆشی و وێرانی و خراپی ...) لەدوایە ، لە ئەنجامی (گڕگرتن و سوتاندن)ەوە نزیکە . بەم جۆرە لە رێگای نزیکی و وێکچوون و پەیوەندی ئەو دوو روداوەوە ، وشەی « ئاگرنانەوە » بەو دوو مانایە ، واتە ـ حەقیقی و مەجازی ـ هاتووە .

هەرچی ماناى مەجازییە لە زمانی کوردیدا پەیدا دەبێ لە ئەنجامی نزیکی و وێکچوونی :

١– شێوە :

بە وێنە وشەی « بارخستن » بە مانای (کردنەوەی بار و خستنی لە شوێنێك) دێت و ئەمەش مانا حەقیقیەکەیەتی . هەروەها بە (کەوتنی مریشك و کەڵەشێریش لەسەر تەنیشت) هەر دەڵێن « بارخستن » و ئەمەش مانایەکی مەجازییە . ئاشکرا دیارە کە نێزیکی و وێکچوون لە شێوەی ئەو دوو ڕوداوەدا هەیە و ئەمەش بووە بە هۆی ئەوەی کە ئەو مانا مەجازییە لە ڕێگای ئەو مانا حەقیقیەوە ئەو مانایەی ناومان برد ببەخشێ .

٢– ئەرك و خاسیەت :

دەبینین کە وشەی « نەرم » بە هەمو شتێك دەوترێ کە ڕەق نەبێت ، بەڵام لە سەرێکی کەوە (مرۆڤی نەرم)یش هەیە . بێگومان لێرەدا ئەو « نەرم »ە مانای ئەوە نادات کە مرۆڤ بە لەش نەرم بێت ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤێکی لەسەرخۆ و ناسك و بەئەدەبە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خاسیەت و ئەرکی ئەم دوو مانایە نزیکن و وێکچوون لە نێوانیاندا هەیە .

٣– لە مانایەکی فراوانەوە کەرتێك ، وە لە کەرتێکەوە مانایەکی فراوان وەربگیرێ :

أ – وەرگرتنی کەرتێك لە مانایەکی فراوانەوە .

بۆ نموونه دەبینین لە زمانی کوردیدا وشەی « بزرکان » مانایەکی گشتی هەیە ، ئەو مانایەش (تێکچوون و شـــپرزەبوونی گیاندارە لە ترساندا). لەم مانا گشتییەوە بەشێك وەرگیراوە ، ئەویش ئەوەیە کە بە (تێکچوونی شیر و ماست و هەندێ شتی تر کە گرۆ گرۆ دەبێ) دەڵێن « بزرکان » . یاخود وشەی « پشتیوان » بە شێوەیەکی گشتی مانای (یاریدەدەر)ە ، وە لەو مانا گشتییەوە ئـەوە پەیدا بووە کە وشەی « پشتیوان » بەو (دارە بوترێ کە لە باری پانی بە پشتی تای دەرگا و دەرابەدا دادەکوترێ).

ب- فراوان بوونی مانایەکی تەسك.

بە وێنە دەبینین لە زمانی کوردیدا وشـــەی « باسقەندە » بە (داردەستێك دەوترێ کە لە داری بەلاڵوك دروست کرابێ). بێشك ئەمە ناوە بۆ یەك شت ، بەلاّم لە هەمان کاتدا ئـــەم مانایە فراوان بووە و بە (هەموو دارێکی باریکی لووســی کون کراو کە کرابێ بە دەسکی قەندە) هەر دەوترێ « باسقەندە » .

## پەیوەندی نیوان وشـە :

لە بەکار هێنانی وشەدا بە مانای جیاواز لە رێگای پەیوەندییەوە لەگەڵ وشەی تردا دەتوانرێ دوو جۆر وشە جیا بکرێتەوە :

١— وشەی بەرەڵلا .

ئەم جۆرە وشـانە دەتوانن لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشـــەدا پەیوەندییان هەبێ ، بە وێنـە وشـــەی « مێز » لە رووی ئەندازەوە دەتوانرێ بوترێ (بچووك ، گەورە ....) ، لە رووی شێوەوە (خڕ ، درێژ ، کورت ، پان ، چوارگۆشـــە ....) ، لە رووی رەنگەوە (سپی ، سوور ... ) ، لە رووی پێویستییەوە (نان خواردن ، نووسین ....) ، لە رووی ئەوەی لە چی مادەیك دروست کراوە (ئاسن ، دار ....) ، لە رووی بەکار هێنان و نەوعیـەتەوە (باش ، جوان ....) .... هتد .

٢— وشەی گیراو .

ئەمیش ئـــەو جۆرە وشانەن کە توانای ئەوەیان نییە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر وشەدا یەك بگرن و لەبەر ئەوە شێوەی بەکار هێنانیان لە قاڵبێکی تەسکدا ماوەتەوە . بە وێنە وشەی « کەڕ ، کۆتەرە .... » لە زمانی کوردیدا ئـــەو توانایە و سەربەخۆییەیان نییە کە لەگەڵ ژمارەیەك پۆلی جیاوازی وشەدا رێك بکەون و بەکار بهێنرێن .

وشەی هاوبێژ (مشترك لفظی Homonym ) :

چۆن لە گشت زمانێکدا ، هـەروەها لە زمانی کوردیدا وشە هەن کە بە خوێندنەوە و نووسین وەك یەکن ، بەڵام مانایان جیاوازە ،

وەك :

ئازار — ئێشی ئەندام .
ئازار — مانگی مارت .
بـاو — دەستور : فیسار شت بووە بە باو .
بـاو — بـاوك .
بـاو — زیادەی شتێك بەسەر شتێکی تردا .

بێگومان ئەو چەند وشەیەی لە سەرەوە ناومان بردن لەو وشانە نین کە ماناکان زۆرە ـ واتە وشـــەی فرەواتا Polysemantic نین ، بەڵـکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوە و نوسیندا وەك یەکن ، ئەگینا لە واتا و پەیدابونیاندا جیاوازن ، وەك : ( « ئازار » ـ ئێشی ئەندام ) کە وشەیەکی کوردییـــە زۆر دورە لە ( « ئازار » ـ مانگی مارت ) کە وشەیەکی کوردیی نییـــە و لە پەیدابوون و دروست بوندا سەرچاوەیەکی تری هەیە . یاخود « باو » دەبینین سێ وشەن کە ماناکان جیاوازە و لە یەك دورن . هەرچەندە هەر سێکیان لە رەسەندا کوردین ، بەڵام پەیدا بون و دروست بونیان لە رێگای جیاوازەوە هاتووە . جا ئەم جۆرە وشـــانە کە لە لێکسیکۆلۆژیدا وشەی هاوبێژ ( Homonym ) یان پێی دەڵێن ، پێویستە لەگەڵ وشەی فرەواتا (Polysemantic)دا جیابکرێنەوە و تێکەڵ نەکرێن[٧] .

---

(٧) بەداخەوە ، لەم رووەوە ـ واتە دەربارەی وشەی هاوبێژ و هاوواتا =

جۆری وشەی هاوبێژ :

لە زمانی کوردیدا سێ جۆر وشەی هاوبێژ بەرچاو دەکەون :

١— ئەو وشە هاوبێژانەی چۆن بە خوێندنەوە ، هەروەهاش بە نوسین وەك یەکن . بۆ نمونە :

= لە زمانی کوردیدا ـ نە بە زمانی کوردی و نە بە زمانی بێگانە هیچ شتێکی وەها نەنوسراوە و ئەمەش نانەواوییەکی زۆر و کەلەبەرێکی گەورەیە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی زمانەکەماندا ، بەڵام ئەوەی شایانی باسە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە هەندێ لە زانایانی کورد ، وەك مامۆستایان ( نۆفیق وەهبی و نەنانی کوردۆ و چەرکەزی بەکۆ ) لە فەرهەنگەکانیاندا لە رێگای کۆشش و زانینی خۆیانەوە بە شێوەیەکی نەجروبی هەندێ کێشەی ئەم کارە ئاڵۆزەیان خاوکردۆتەوە . هەروەها لە لاپەڕە ( ٥٦٩ ـ ٦٢٣ )ی ، ژمارە دوی ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد »دا ( بەغدا ١٩٧٣ ) ، مامۆستا جەمال بابان لە ژێر ناوی « هەندێك لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن »دا وتارێکی بلاوکردۆتەوە ، بەلام کەم و کورتی و هەڵەی هەرە گەورەی ئەم باسە لەوەدایە کە نوسەر وشەی هاوبێژ و فرەواتای جیا نەکردۆتەوە ، بە وێنە :

ناوڵە ـ نەویلەی ولاخ .

ناوڵە ـ جۆرە یارییەکە کە بە بۆلی نەختە و زار دەکرێت .

تیرە ـ هۆز ، ئێل ،

تیرە ـ تیرەی بن کلاش .

ئەمانە و گەلێکی تر ـ کە زوربەی ئەو نمونانە دەگرنەوە کە =

ئاش — جۆی هاڕین و پاکردنی دانەوێڵە .

ئاش — چێشت .

٢— ئەو وشە هاوبێژانەی بە نوسین وەك یەکن ، بەڵام لە خوێندنەوەدا جیاوازییان هەیە ، وەك :

هەمانە[٨] — ( هە ) ـ رەگی کرداری ( هەبن )ە[٩]

(مان) ـ جێناوی لکاوی کۆیە

( ە ) ـ نیشانەی وجودە لە حاڵدا .

هەمانە[١٠] — کیسەیەك لە پێستی مەڕ و بزن دروست کرابێ .

٣— ئەو وشە هاوبێژانەی لە هەندێ حاڵاتی رێزماندا لەیەك نێزیك دەبنەوە ، وەك :

---

= مامۆستا جەمال بابان لە وتارەکەیدا هێناویتیەوە ـ لەو وشانە نین کە واتایەك زیاتر دەبەخشن ، وانە وشەی فرەوانا نین ، بەڵکو ئەو وشانەن کە لە رێگای چەند هۆیەکی تایبەتیەوە بە خوێندنەوە و نوسین وێكدەچن ، وانە ئەمانە وشەی هاوبێژن ، نەك فرەوانا .

(٨) لەم وشەیەدا گڕە وا بەسەر بڕگی دووەمەوە .

(٩) ئەمە کردارێکە کە چاوگەکەی لە بیر چۆتەوە .

(١٠) لێرەدا گڕە وا بەسەر بڕگی شەشەمەوە ( دواینەوە ) .

تاڵە — گیانداری رەشی درێژ .

تاڵە — (تاڵ) ـ ئاوەڵناوە .

( ە ) ـ نیشانەی وجودی حاڵە .

بۆ — کوندەبەبۆ .

بۆ — کردارێکی رابوردووە کە لە چاوگی (بوون)ەوە وەرگیراوە .

رێبازی پەیدابوونی وشەی هاوبێژ :

١— بوونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتێك لە زمانی کوردیدا هۆیەکی گرنگە لە پەیدابوونی وشـــەی هاوبێژدا . بە وێنە وشەی « بەش » لە دیالێکتی کرمانجی خواروودا مانای ( هێندێ لە شتێك کە بڕدرابێ بۆ یەکێك ) دەبەخشێ ، وە هـەر ئەم وشـەیە لە دیالێکتی کرمانجی ژووروودا بە ( گیانداری ناوچەوان سپی ) دەڵێن .

٢— لە ئەنجامی تێپەڕبوونی کات و رۆژگاردا واتاکانی هەندێ وشەی فرەواتا لەیەك دوور کەوتوونەتەوە و وشەی هاوبێژیان دروست کردوە ، وەك :

زێ — رووباری زۆر گەورە .

زێ — زێی مێینە .

٣— چۆن له مێژوی پەیدابونی وشەی گشت زمانێکدا ، هەروەها له مێژوی پەیدابونی وشەی کوردیدا وا رێکەوتووه کە دوَ وشه ، یاخود پتر دابڕاون بەسەر شتی جیاوازدا و به رێکەوت شێوەی دەربڕینیان وەك یەك بووە . به وێنه :

باهوَ — شان و قۆڵ .

باهوَ — ئاسۆ .

٤— هەندێ وشه که له زمانی بێگانەوە کەوتونەته ناو زمانی کوردییەوە ، وا رێکەوتووە لەگەڵ وشەیەکی کوردیی رەسەندا لـه نوسین و خوێندنەوەدا وەك یەك بن و له هەمان کاتیشدا هەر یەکه مانای تایبەتی و جیاوازی خۆی هەبێت ، وەك :

بیر — بیر و هۆش .

بیر — ( بئر ـ عەرەبی ) .

جگه لەو چەند رێگه سەرەکیانه ، هەروەها هەندێك جار له حالەتی کۆرینی وشـــەدا و لکاندنی ئامراز و هـەروەهـا کورت کردنەوە و سوانەوە ، وشەی هاوبێژ پەیدا دەبێ .

بەم جۆرە دەبینین کە دەوڵەمەندی و فراوانی زمانی کوردی تەنها له زۆری وشه و مانای جۆێ جوێدا دەرناکەوێ ، بەڵـکو له دەوری چالاك و سامانی بەرین و بەنرخی وشـــەی هاوبێژیشدا دەردەکەوێ .

## وشەی هاوواتا ( مرادف Synonym ) :

بەو وشانە دەڵێن کە یەك مانا دەبەخشن ، یاخود مانایان لێك نزیکە ، بەڵام لە خوێندنەوە و نوسینیاندا جیاوازن ، وەك :

لێڕ – دارستان – جەنگەڵ .

ئاوارە – پەڕیوە – دەربەدەر .

جەندەك – کەلاك – تەرم – کەلەش .

توش – دژوار – سەخت – ناخۆش .

خەم – کەسەر – خەفەت .

خاپور – وێران .

........................... هتد .

سەرچاوەی وشەی هاوواتا :

لە پەیدابون و کۆبونەوەی وشەی هاوواتای کوردیدا چەند ڕێگایەکی جیاواز دەوریان بینیوە :

١— چۆن بونی چەند دیالێکتێك و بەشە دیالێکتیك لە زمانی کوردیدا بووە بە هوی پەیدابونی وشەی هاوبێژ ، هەروەها بوشە بە هۆی پەیدابونی گەلێك وشەی هاوواتا :

أ – بەشێك لەو وشەی هەوواتایانە لە خوێندنەوە و نوسیندا لەیەك دورن ، وەك :

ئەوَك — قوَزك .
گەلەك — گەلێك ـ فرە ـ پڕ ـ زۆر .
بەدەو — جوان ـ قەشەنگ ـ چەلەنگ .
باهوَر — باهۆر ـ رەشەبا .

ب ) هەندێکیشیان ئەو وشە هاوواتایانەن کە لە خوێندنەوە و نوسیندا تا رادەیەك وێكدەچن ، بەلاّم لە شـــێوەی فۆنێتیکدا تۆزێك جیاوازی هەیە . ئەو جۆرە وشانەش لە ئەنجامی لێك نزیك بونەوەی هەندێ دەنگ ، یاخود لە ئەنجامی خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی کوردیدا پەیدا بوون ، وەك :

م / و — دامێن ـ داوێن .
ه / و — هشك ـ وشك .
ف / و — چاف ـ چاو .
ی / وَ — پاری ـ پاروَ .
ه / ی — تەنیا ـ تەنها .
آ / ێ — ما ـ مێ .
ئـ / ه — ئەسپ ـ هەسپ

........................ وە گەلێکی تر (11) .

---

(11) ئەم جۆرە وشە هاوواتایانە کە لە ئەنجامی نزیکی دەنگە ، یاخود خاسیەتی تایبەتی بەشە دیالێکتەکان و دیالێکتەکانی زمانەکەمانەوە هاتون ، پتر بەبوەندییاز==

٢ـ لە ئەنجامی بەکار هێنانی شێوازی جودا لە چۆنێتی داڕشتن و دروست کردنی وشـەدا گەلێك وشەی هاوواتا لە زمانی کوردیدا پەیدابوون ، وەك :

بەرەوژێر — بەرەوخوار

بەرەوخوارکە — بەرەوخوارە

بـەرەولێژە — سەرەولێژە

٣ـ هەرچەندە لە زمانی کوردیدا بۆ هەندێ مانا وشەی رەسەنی کوردی هەبوون ، بەڵام لەگـەڵ ئەوەشدا وا رێکەوتووە کە بۆ هەمان مانا لە زمانی بێگانەوە وشە بکەونە زمانەکەمانەوە و لەگەڵ وشـــە کوردییەکاندا ببن بە هاوواتا ، وەك :

زەوی — ئەرز — عەرد ، — هەرد .

مەردوم — مرۆ — مرۆڤ — ئادەمیزاد — ئینسان .

هـەژار — بەلەنگاز — فەقیر .

## وشەی دژواتا Antonym :

لە ســـەرەوە رونمان کردەوە کە لە نیوان ژمارەیەکی زۆر لە

---

= بە باـی فۆنێتیکەوە هەیە ، جا هەر لە بەر ئەوەشە کە لەم رووەوە شتێکی کەمم نوسیوە . دەربارەی ئەم جۆرە وشانە باسێکی سەربەخۆم هەیە ، هیوادارم بەم زوانە بە وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

وشەکانی زمانی کوردیدا پەیوەندیی هاوواتایی هەیە . هەروەها پەنجەش بۆ ئەوە رادەکێشین کە پەیوەندیی دژواتایش لە زمانەکەماندا دەوری خۆی دەبینێ .

وشەی دژواتا بەو وشانە دەوترێ کە لە ماناادا بەرامبەر یەکتر دژ وەستاون ، وەك :

گەورە — بچوك .
زۆر — کەم .
بەرز — نزم .
چاك — خراپ .
دوَر — نزیك .
روَناك — تاریك .

لەو نموونانەی سەرەوەدا ئاشکرا دیارە کە هەر وشەیەك رەگی جیاوازی خۆی هەیە ، هەروەها وشەی دژواتا دەتوانن خاوەنی یەك رەگ بن ، وەك :

خۆش — ناخۆش .
راست — ناڕاست .
بەنرخ — بێ نرخ .

پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین کە وەنەبێ هەموو وشەیەکی

زمانی کوردی بەرامبەری وشەی دژواتا هەبێت . بۆ نموونە بەرامبەر هەندێ ناو ، وەك : خانوو ، دەرگا ، کتێب ، وشتر .....؛ زوربەی جێناو ؛ تێکڕایی ژمارە وشەی دژواتا نییە .

تەقەڵ لە « تێگەیشتنی ڕاستی » دا هەرچەندە کەم بەرچاو دەکەوێ ، بەڵام ئەو شوێنانەی تیایاندا دانراوە ، نەك هەر شوێنی لەبارن ، بەڵکو شوێنی سەرەکیشن . بەوێنە کە نووسیویە : « حکومتیکی مشروطەی (دیموقراتیە) ـ یعنی باشتراك فکر هموم رعیت ـ تاسیس بکا و . . . » (ژ ٥ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢) ولەو شوێنانەدا نیشانەی تەقەڵی داناوە ، ئەرکی دەربرین و خستنە پێش چاوی باری ڕێزمانی ڕستە شوێنکەوتووەکەی دیاری کردووە . لەم چەشنە شوێنانەدا دانانی تەقەڵ لە کۆما باشترە ، چونکە لەم جۆرە جێگایانەدا کۆما تەنیا جیاکردنەوە نیشان دەدا ، بەڵام تەقەڵ لە یەك کاتدا جیاکردنەوەش و لێك دانیش دەردەبڕێ . . . « تێگەیشتنی ڕاستی » هەروەها کە لە (ژ ٢ ، ل ١ ، س ١ ، د ٦) دا نووسیوێتی : « ام سؤالە معنیدارە بی شك جوابی ـ هیچە ـ کردان هەمو وقتی سربست و آزا ژیابون » و لە پێش و پاشی وشەی (هیچە) وە نیشانەی تەقەڵ دادەنێ ، ئەوە واتای وەستان و ئاوازی تایبەتی و خستنە پێش چاوی وشەیەکی لە ناکاو بەکارهێنراو دەگەیەنێ .

**دووکەوانە ( ) :**

دەشێ پارچەیەکی ڕستە یان ڕستەیەکی سەرلەبەر یان چەند ڕستەیەك لە نێو دووکەوانەدا دابنرێ .

دووکەوانە نیشانەیەکی واتایی یە . بە زۆری سەرنجی تەواوکەری واتا و ڕوونکردنەوەی هەمەجۆر دەخرێنە نێو دوو کەوانەوە . لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بەکارهێنانی نیشانەی دووکەوانە لە پلەی یەکەمدا بەندە بە واتاوە ، بەڵام وەك ئا . م . پیشکۆڤسکی ڕادەگەیەنێ ، ڕاست نییە وا دابنرێ کە دووکەوانە « هیچ مانایەکی ڕێزمانی نییە »[٢٧] . خۆ ناشێ هەر پارچەیەکی ڕستە بخرێتە نێو دووکەوانەوە . تەنیا ئەو پارچانە دەخرێنە نێو دووکەوانەوە کە نەك هەر لە ڕووی واتاوە ، بەڵکو لە ڕووی ڕێزمانیشەوە دیاری دەکرێن .

---

(٢٧) ئا . م . پیشکۆڤسکی ، دەوری خوێندنەوەی باش لە فێرکردنی نیشانەکانی خاڵبەندی دا ، « کارە هەڵبژاردەکانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٢٥ .

واش بووه به باو که ئه‌و پارچه‌یه‌ی ڕسته یان ئه‌و ئه‌ندامه‌ی ڕسته ده‌خرێته نێو دووکه‌وانه‌وه ، که‌وا له باری ڕێزمانه‌وه که‌متر پێوه‌ندی به ئه‌ندامه‌کانی تری ڕسته‌که‌وه هه‌یه . هه‌روه‌ها ئه‌و حاڵه‌ته‌ش به‌دی‌ده‌کرێ ، که ئه‌ندامی پێویست و گرنگی ڕسته له‌نێو دووکه‌وانه‌دا داده‌نرێ . . .

له نووسینی کوردیدا زۆر جار ناوی تایبه‌تی (ناوی مرۆڤ و چیا و ڕوبار و شار و دێ و وڵات و میلله‌ت . . .) ، به‌تایبه‌تی هی بێگانه له‌نێو دووکه‌وانه‌دا ده‌بینرێ . وه‌ك ئاشکرایه له نووسینی لاتینی‌دا ئه‌و جۆره وشانه به پیتی گه‌وره ده‌ست‌پێ ده‌که‌ن و به‌مه سه‌رنجی خوێنه‌ریان بۆ ڕاده‌کێشرێ . هه‌رچی پیته‌کانی عه‌ره‌بی‌یه له ڕووی گه‌وره‌یی و بچووکی‌یه‌وه وه‌ك یه‌کن و له‌به‌رئه‌وه ده‌رخستنی ئه‌و چه‌شنه ناوانه به ئه‌لفوبێکه جی به‌جێ ناکرێ . جا له‌به‌ر ئه‌و هۆیه‌و هه‌ندێ هۆی دی له گه‌لێ نووسینی کۆن و نوێی کوردیدا ئه‌و جۆره وشانه خراونه‌ته نێو دووکه‌وانه‌وه . . . له « تێگه‌یشتنی ڕاستی » دا ئه‌و دیارده‌یه نه‌ك هه‌ر زۆر به‌رچاو ده‌که‌وێ ، به‌ڵکو شاره‌زایانه‌ش مامه‌ڵه‌ی له‌گه‌ڵ کراوه .

چه‌ند نموونه‌یه‌ك :

١ ـ (سیبریا) و (فلندا) و (اوکراینه) له هرای روسیه استفاده‌یانکر . . . (ژ ٣ ، ل ١ ، س ١ ، د ١٦) .

٢ ـ معاهده‌کان له (پارس) و (لوندره) و (برلین)دا همتیکی وایان کرد . . . (ژ ٥ ، ل ١ ، س ٢ ، د ١٩ ـ ٢٠) .

٣ ـ له(بکین)وه خبر هات . . . (ژ ٢ ، ل ١ ، س ٢ ، د ٢٣) .

٤ ـ ایتالیانه‌کان الین : (کول‌دلروسو) و شاخی (ڤالیلا)مان گرته‌وه . . . (ژ ١ ، ل ١ ، س ١ ، د ٣٢)[٢٨] .

. . . هتد .

---

(٢٨) « تێگه‌یشتنی ڕاستی » له چه‌ند شوێنێکی که‌مدا نیشانه‌ی [ ] ـ واته (العضادتان) ی به‌کارهێناوه ، وه‌ك :

« دوشمن له میدانی [ کنبره ] شره توپیکی چاکی کرد » (ژ ٣ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ١٥) .

« . . . . [ اورنبرك ] ی به بی شر کرت » (ژ ٣ ، ل ٢ ، س ٢ ، د ١١)

بێگومان چ له‌و شوێنانه‌ی ناومان بردن و چ له هه‌ر شوێنێکی دی‌دا دایناوه ، ڕاست وابوو نیشانه‌ی دووکه‌وانه به‌کاربێنێ .

له شارەزایی « تێگەیشتنی ڕاستی »دا مەبەستم ئەوە نییە بڵێم ، باشی کردووە ئەو ناوە تایبەتی یانەی لەنێو دووکەوانەدا داناوە ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە ئەو ئامراز و وشانە بەدوا یان لەگەڵ ناوە جوگرافی یەکاندا دێن نەیکردوونەتە بەشێك لێیان و بەجیا نووسیونی . بەوێنە لە نموونەی یەکەم و ئەوانی دی‌دا واوی پێوەندی لەگەڵ وشەکانی نێو دوو کەوانەدا دانەناوە ، بەڵکو بەجیا نووسیونی . لە نموونەی دووەمدا پۆستپۆزیشنی (دا) و ، لە نموونەی سێیەمدا پۆستپۆزیشنی (ەوە) و لە نموونەی چوارەمدا جێ ناوی لکاو (مان) ی یەکسەر لە پشت کەوانەکانەوە نووسیوە . . . ئەگەرچی زیادەی وەك جێ ناوی لکاو و پۆستپۆزیشن . . . تێکەڵ بە وشەکانی پێش خۆیان دەبن و لەگەڵیان دەنووسرێن ، بەلام کاتێ وشە دەخرێتە نێو دووکەوانەوە ڕاست وایە زیادی‌یەکەی لێ بکرێتەوە و لەپشت کەوانەکەوە دابنرێ ، چونکە بۆ نێو دووکەوانەکە ئەسڵی وشەکە مەبەستە و باری ڕێزمانی دەیشێوێنێ . . . جا کە ئێمە لەمە بێ‌گومان بین ، ئەوە لە نووسینی واوی پێوەندی‌دا ، دەبێ تەواو دڵنیا بین .

ڕەنگە زۆر ڕۆیی نەبێ ، ئەگەر بڵێم لە سەرانسەری ژمارەکانی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا تێکرا نەك هەر ئەوجۆرە ناوە تایبەتی یانە ، بەڵکو هەر دەستەواژە و هەر ڕستە و هەر شتێکی دی کە خرابنە نێو دووکەوانەکە نووسراون . لەوەش سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە ، لەبەرئەوەی واوی پێوەندی وشەیەکی سەربەخۆیە هەندێ دوور لە پشت کەوانەکەوە دانراوە ، بەلام پۆشتپۆزیشن و جێ ناوی لکاو چونکە سەربەخۆ نین ، یەکسەر بە پشت کەوانەکەوە نووسینراون . . . بەلام ئەوەی جێی سەرنج و داخ بێ ، ئەوەیە لە نووسینی بەشێك لە زمانەوانانی ئەمڕۆی کورددا ، لەو ئەلفوبێ زمانەوانی یەدا گەلێ هەڵە بەرچاو دەکەوێ[29] .

**کەوانەی دووتایی « » :**

دەقی وەرگیراوی بێ‌دەستکاری دەخرێتە نێوان کەوانەی دووتایی‌یەوە ـ واتە کەوانەی دووتایی نیشانی قسەی ڕاستەوخۆ دەدات . لەم حاڵەتەدا دەشێ بڵێین

---

(٢٩) بەوێنە ، مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی لە کتێبی ناوبراودا نووسیویە : « لە (ئاوێستادا) پاشبەندی . . . » (ل ٤١) ؛ « . . (زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا و) (وشەڕۆنان) ی (ل ٦٥) . . .هتد .

ئەركی تارادەیەك بریتییە لە خستنە پێش چاو و دەرخستنی بەشێكی تێكستەكە .
بۆ نموونە :
ئێمە لە كوردەواریدا بەم جۆرە بارانە دەڵێین : « گورگە زێ » . . .
(دمدم ، ل ٢٤)

دوكانداران بانگیان دەكرد : « وەرن برا وەرن ، وەرن كاكە وەرن ، ماڵی چاك و هەرزان بكڕن » . . .
(دمدم ، ل ٢٦)

ئەو قژە زەردە ، ئەو چاوانە ڕۆ !
ئەو نەغمەی «دایە» و «بابە» جوانەڕۆ !
(گۆران ، ل ٩٤)

كاتێ ناوی كتێب ، گۆڤار ، ڕۆژنامە ، وتار . . . ناوی كۆمەڵە ، لیژنـە ، دەزگا . . . بە كەوانەی دووتایی جیادەكرێنەوە و دیاری دەكرێن ، ئەوە كەوانەی دووتایی دەبێتە وەسیلەی ڕازاندنەوە و بێدەستكاری نیشاندانیان .
كتێبی « كوردستان و كورد » شاكاری قاسملووە .
(مێژوو ، ل ٢١٥)[٣٠]

گۆڤاری «هاوار»یش بەشی خۆی بایەخی بە مێژوو داوە .
(مێژوو ، ل ١٣٧)

مێژووی كورد لە ڕۆژنامەی «تێگەیشتنی ڕاستی»دا باش ڕەنگی داوەتەوە .
(مێژوو ، ل ١٣٦)

---

(٣٠) د. كەمال مەزهەر ئەحمەد ، مێژوو ـ كورتە باسێكی زانـستی مێژوو و كورد و مێـژوو ، بەغدا ، ١٩٨٣ .

وتاره نایابەکانی خوالێخۆشبوو ئیسماعیل حەقی شاوەیس . . . وەك : « کۆمەڵی کوردستان » و « ناودارانی کورد . مەلا سەلیم ئەفەندی » و « کۆمیتەی ئیستیقلالی کوردستان » . . .

(مێژوو ، ل ١٤٨)

یەکێکیش لە بڕیارەکانی کۆنگرە دەربارەی دامەزراندنی «کۆمەڵەی کوردناسیی جیهانی» بوو .

(مێژوو ، ل ٢٤٤)

لە لیژنەی « ئیمپریالیزم و بزوتنەوەی ڕزگار یخوازی نەتەوەیی » دا . . .

(مێژوو ، ل ٢٤٢)

. . هتد

لە زۆر زماندا دەبینین وشەی نوێباو و ئەو وشانەی واتای گاڵتە دەگەیەنن لەنێو کەوانەی دووتایی دا دایان دەنێن . دەکرێ ئەمە بە ڕووی واتایی دابنرێ . ئەگەرچی ئەم جۆرە وشانە لە نووسینی کوردیدا بە زۆری وا ڕۆیشتووە کە لەنێو دووکەوانەدا دابنرێن ، بەڵام ڕاستتر وایە بخرێنە نێو کەوانەی دووتایی یەوە .

**نیشانەی پرسیار (؟) و نیشانەی سەرسامی (!) :**

نیشانەکانی پرسیار و سەرسامی ، هەروەك خاڵ ، لە یەك کاتدا دوو ئەرك بەجێ دێنن . ئەو نیشانانە کە لە کۆتایی ڕستەدا بەکاردێنرێن ، سنوور لە نێوان ڕستەیەك و ڕستەیەکی دیدا دادەنێن و کۆتایی ڕێزمانی یان دیاری دەکەن ـ ئەمە ئەرکی سینتاکسی یانە . جگە لەوە خاسیەتی هەواڵگەیاندنێکی تایبەتی نیشان دەدەن ـ ئەمەش ئەرکی واتایی یانە .

نیشانەی (؟) بۆ پرسیار ؛ نیشانەی (!) بۆ خۆشی و شادی ، خەم و خەفەت ، سەرسوڕمان و سەرسام بوون ، بڕوا و گومان ، سکاڵا و دوعا ، هەڕەشە و تووڕەبوون . . . بەکاردێ .

ڕستەیەك لە کۆتاییەکەیدا نیشانەی پرسیار یان سەرسامی دانرابێ ، بە ئاوازێکی تایبەتی پرسیار یان سەرسامی دەردەبڕرێ . بەوێنە :

ـ زالم ئەمر دەكات خاچۆ گیان ، من ئەمر بەسەر تۆدا ناكەم ، بەلام دوێنێ خانۆ ڕایسپاردم كە بێمە كن جەنابت لێت بپرسم چەندت ئاسن پێویستە بۆ كار تا بنێرین بۆت بكڕین ؟

(دمدم ، ل ۳۷ ـ ۳۸)

قژ كاڵی ، لێو ئاڵی ، پرشنگی نیگا كاڵ ،
ئەی كچە جوانەكەی سەرگۆنا نەختێ ئاڵ !

(گۆران ، ل ٤٥)

مەلی ناو فەزای نامۆتەناهیم !
دڵی لاوم ڕۆ !

(گۆران ، ل ۲٥)

(مەترۆ)ت ئەڵێی نوێنگەی نیگارە ،
(مەیدانی سوور) جێی هەزاران هەزارە !

(گۆران ، ل ۳۰۳)

. . . هتد .

نیشانەكانی پرسیار و سەرسامی ، هەروەها دەلوێ لە ناوەندی ڕستەدا بەكاربهێنرێن ، بەتایبەتی لە بارێكدا دابەش‌كردنی واتای پرسیار یان سەرسامی مەبەست بێ . بەوێنە :

كام ڕەشی ئەگا بە ڕەشی چاوی ؟
برژانگی ؟ برۆی ؟ ئەگریجەی خاوی ؟

(گۆران ، ل ۱۰)

كەڕووی لێ‌نیشت گەردی شیعرم ،
هەی جوانەمەرگە خۆم ! هەی بمرم !

(گۆران ، ل ۳۹)

لەپاڵ یەك دانانی دوو نیشانەی (؟!) بۆ کۆکردنەوەی چەند واتایەك دەگونجێ ، بە واتایەکی تر ، کاتێ ئەو پرسیارەی دەکرێ جێی خۆشی یان ناخۆشی یان سەرسامی . . . بێت . بەوێنە :

دوکانداران کە دیتیان ، گوتیان : «دەك بەخێر نەیێت ، ئاخۆ دیسان چ بڵێ !؟»

(دمدم ، ل ٢٩)

لە چاپەمەنیدا ، هەروەها دانانی دەستەیەك نیشانەی سەرسامی بەرچاو دەکەوێ . بەوێنە :

هەمزە چاوەش بۆ خۆی لە دوورەوە وەستابوو ، بە دەنگێکی نێرانە بانگی راهێشت :

ـ ئامادە بن !!

(دمدم ، ل ٧٠)

ـ ئەی قولی خان کوا ؟

ـ لە شەڕدا کوژرا !!

(دمدم ، ل ٢٣٩)

واتای نیشانەی پرسیار هێندە دیار و ڕوون و ئاشکرایە ، کە دەشێ بە یاریدەی ئەو نیشانەیە ، تەنانەت بە بێ وشەش مەبەست دەربڕێ . بەوێنە :

ـ من دەزانم کەی دێتەوە

ـ ؟

ـ سبەینێ .

●

●

# سەرچاوە

## بە زمانی کوردی


(١) ئینجیل مەتی ، ١٩١٩ .

(٢) ئینجیل مەرقۆس ، ١٩١٩ .

(٣) ئینجیل لۆقا ، ١٩١٩ .

(٤) ئینجیلا لۆقا ، بەیرووت ، ١٩٥٣ .

(٥) ئینجیل یوحەننا ، ١٩١٩ .

(٦) ئەحمەدی عەزیز ئاغا ، ئەلفبای کوردی ، چاپی سێیەم ، بەغدا ، ١٩٣٦ .

(٧) ئەمینی عەڤدال ، خەبەرناما کوردییا راستنڤیساندنە ، یەریڤان ، ١٩٥٨ .

(٨) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، پێداچوونەوەیەکی هەندێ بیروڕای زمانەوانیی مامۆستا مەسعوود محەمەد ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، ژ ٩٠ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، بەشی یەکەم ، ل ١٠ ـ ١٥ ؛ ژ ٩٢ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، بەشی دووەم ، ل ١٣ ـ ١٨ .

(٩) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، چەند وشەیەك دەربارەی وتاری (لەگەڵ دەنگسازی کوردیدا) ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ٩٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٦٢ ـ ٦٩ .

(١٠) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێزمانی کوردی ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٩ .

(١١) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووسی کوردی لە ڕۆژنامەی « تێگەیشتنی ڕاستی»دا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ١٠ ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل ٧٦ ـ ١٣١ .

(١٢) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٤ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٣٩ ـ ٤٧ .

(١٣) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ .

(١٤) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، کورتەیەکی مێژووی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٨ ، بەغدا ، ١٩٨١ ، ل ٦٦ ـ ١٢٠ .

(١٥) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ١٩٨٢ ، ل ١٦ ـ ٧٧ .

(١٦) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، لە ڕێگای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و زانستدا ، ڕۆژنامەی « عێراق » ، بەشی یەکەم ، ژ ٢١٦٠ ، بەغدا ، ٩ ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٢١٧٩ ، بەغدا ، ٣٠ ی مارتی ١٩٨٣ ، ل ٧ .

(١٧) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، مووررووی مالاوسێ مەگەر بە شەو بکرێتە مل ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥١ ـ ٧٤ .

(١٨) د. ئەورەحمانی حاجی مارف ، نووسین و جۆرەکانی و مێژووی ، گۆڤاری « کاروان » ، ژ ٨ ، هەولێر ، ١٩٨٣ ، ل ٤٦ ـ ٥٠ .

(١٩) د. ئەورحمانی حاجی مارف ، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٧ .

(٢٠) ئۆسکارمان ، تحفهء مظفریه ، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانەوە سەر ڕێنووسی کوردی هێمنی موکریانی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٨ .

(٢١) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێ ، بەغدا ، ١٩٥١ .

(٢٢) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێ بۆ گەورە ، بەغدا ، ١٩٥٥ .

(٢٣) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان ، بەغدا ، ١٩٥٣ .

(٢٤) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان ، بەغدا ، ١٩٥٦ .

(٢٥) ئیبراهیم ئەمین باڵدار ، زەنگی کاروانی ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٧٨ ـ ١١١ .

(٢٦) د. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، رستەی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ رستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندی‌یەکانی زمانی کوردی‌دا ، بەغدا ، ١٩٨٠ .
(٢٧) ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم ، گیروگرفتی نووسینی فرمان لەگەل راناو لە رووی پێکەوە نووسان و پێکەوە نەنووسانەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٥٠ - ٤٨٨ .
(٢٨) ب ، چۆن زمانەکەمان بنووسین ؟ ، گۆڤاری « هیوا » ژ ٤ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ١٠ - ١٧ .
(٢٩) ب . چۆن زمانەکەمان بنووسین ؟ بە پیتی عەرەبی یا لاتینی ؟ ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٧ ، ل ٨ - ١٩ .
(٣٠) ب . فرمانی ئێستەمان ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٧ - ١٨ .
(٣١) بانگەوازێك لە دەستەی کوردیی کۆڕی زانیاری عێراقەوە (کۆڕێك بۆ گیروگرفتی رێنووسی کوردی) ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق - دەستەی کورد » ، ب ٧ ، بەغدا ، ١٩٨٠ ، ل ٢٩٦ - ٢٩٨ .
(٣٢) بانگی کوردستان ، سلێمانی ، ١٩٢٢ - ١٩٢٦ (کۆکردنەوەو لەسەر نووسینی جەمال خەزنەدار ، بەغدا ، ١٩٧٤)

(٣٣) بلە ، خۆپاراستن لە لایەنگیریی ناراستی ، گۆڤاری « شەفەق » ، ژ ٥ - ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٦ - ١١ .
(٣٤) بلە ، وتەی پێشکەش‌کردن ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٥ - ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٣٩ ، ل ٢ .
(٣٥) بەشیر مشیر ، سیپارەی حەق‌پەرستی ، بەغدا ، ١٩٣١ .
(٣٦) پرسیاری گەلاوێژ (زمانی کوردی و چۆنیەتی نووسینی) ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٩ ، ساڵی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥١ .
(٣٧) پیرۆت ، کوردی بە چی حەرفێ بنووسرێ ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، ژ ١١ - ١٢ ، بەغدا ، ٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ - ١١ .

(٣٨) توفیق وەهبی ، ئەسڵی پیتە قاڵبی (ئە)ی شێوەی سلێمانی ، گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٩ ـ ٢٨ .
(٣٩) توفیق وەهبی ، بۆ جەنابی ماموّستا سەعید صدقی بەڕێز ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ ـ ٦ .
(٤٠) توفیق وەهبی ، دەستوور ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٥ ـ ٧ .
(٤١) توفیق وەهبی ، دەستووری زمانی کوردی ، جزمی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٢٩ .
(٤٢) توفیق وەهبی ، خوێندەواری باو ، بەغدا ، ١٩٣٣ .
(٤٣) توفیق وەهبی ، سوپاس ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٣ ـ ٥ .
(٤٤) توفیق وەهبی ، فۆتۆگراف ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ ـ ٩ .
(٤٥) توفیق وەهبی ، کوردییەکەمان بە چۆن حروفێك و چۆن بنووسین ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ ـ ٦ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٦ ، بەغدا ، ٢٩ ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٥ ـ ٦ .

(٤٦) د. جەمال نەبەز ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، گۆڤاری «ئاسۆی زانکۆیی» ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ٨٩ ـ ٩١ .
(٤٧) د. جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، بامبێرگ ، ١٩٧٦ .
(٤٨) د. جەمال نەبەز ، سەرنجێك لە چەند زاراوەیەکی تازە بەکارهاتوو و کۆڕی زانیاری کورد ، «گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات» ، ١٩٧٨ ، ژ ١٢ ، ل ٧٩ ـ ١١٥ .
(٤٩) جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ، چۆن زمانەکەمان بنووسین ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ١٠ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٨ ـ ١١ ، ٨٩ ـ ٩٤ .
(٥٠) جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی ، ڕاستکردنەوە ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١١ ـ ١٨ .

(٥١) حاجی مەلا ڕەسووڵ زادە مەلا مستەفای سەفوەت ، هۆنراوەی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٣٥ .
(٥٢) حامید فەرەج ، ئەلفوبێی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣٦ .
(٥٣) حامید فەرەج ، ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(٥٤) حسەین حوزنی موکریانی ، پێشوای ئایین ، ڕەواندز ، ١٩٢٧ .
(٥٥) حسەین حوزنی موکریانی ، قاعیدەیەکی کە لە گۆڤاری زاری کرمانجیدا قبووڵ کراوە بۆ نووسین ، گۆڤاری « زاری کرمانجی » ، ژ ٧ ، ڕەواندز ، ٢ ی کانوونی دووەمی ١٩٢٧ ، ل ٢٨ .

(٥٦) حەسەن ئەلسەبباغ و . . . ، کتێبی « ئەشیا و سەرەتای سروشت بۆ سنفی پێنجی ئیبتیدائی » ، محەمەد عەلی پژدەری کردوویە بە کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٥ ـ ١٩٥٦ .
(٥٧) حەسەن ئەلسەبباغ و . . . ، کتێبی « دەرسی ئەشیا و مەبادی تەبیعەت بۆ پۆلی چوارەمی ئیبتیدائی » ، عەبدولڕەحمان نورجان و شێخ نیعمەتوڵڵا کردوویانە بە کوردی ، چاپی چوارەم ، بەغدا ، ١٩٥٥ .
(٥٨) حەسەن کوردستانی ، لە حەق نووسین تازە ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١١ ی مایسی ١٩٢٦ ، ل ٨ ـ ١٠ .
(٥٩) حەقی شاوەیس ، ئیملای کوردی ـ حروفاتی عەرەبی ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٤ ی تەمووزی ١٩٢٥ ، ل ٧ ـ ٩ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٠ ، ٢١ ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥ ، ل ٩ ـ ١٢ .
(٦٠) حەقی شاوەیس ، لاپەڕەی نووسینی تازە و کوردی پەتی : لە نووسین و شێوەدا سەربەخۆ ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ١٣ ـ ١٤ ، بەغدا ، ٥ ی مارتی ١٩٢٦ ، ل ١٨ ـ ٢٠ ؛ بەشی دووەم ، ژ ١٥ ، بەغدا ، ١٨ ی مارتی ١٩٢٦ ، ل ١٠ ـ ١٢ .
(٦١) حەقی شاوەیس ، نووسینی کوردی چۆن بێ ، گۆڤاری « دیاری کوردستان » ، بەشی یەکەم ، ژ ٥ ، بەغدا ، ١٢ ی مایسی ١٩٢٥ ، ل ٧ ـ ٨ .

(٦٢) دانەری ئەلفوبێی کوردی ، چۆن بنووسین ، رۆژنامەی « زبان » ، ژ ٩ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٤ ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧ ، بەشی یەکەم ، ل ٥ ـ ٦ .
(٦٣) داوەر ئـەردەلانی ، چـۆن بکـۆشـین ، گـۆڤـاری « ژین » ، ژ ١٨ ، ئەستەموول ، ٨ ی مایسی ١٣٣٥ ك / ٨ ی مایسی ١٩١٩ ز ، ل ١٦ .
(٦٤) داوەر ئەردەلانی ، هێشتا نووستووین ، گۆڤاری « کـوردستان » ، ژ ٧ ، ئەستەموول ، ٨ ی مایسی ١٣٣٥ ك /٨ ی مایسی ١٩١٩ ز .
(٦٥) دەستنـووسی ژمارە (٤٤٨)ی کتێبخـانەی کـۆڕی زانیـاری کـورد (مـەلا محەمەدی سیوچی ، تذکره العوام یان بەیتی ئەوەڵ و ئاخر ، ساڵی ١٩١٩ ، لەلایەن سەعید عەبدوڵلا موکرییەوە نووسراوەتەوە) .
(٦٦) دیاری مەلا محەمەدی کۆیی ، نشریات زار کرمانجی ، ڕەواندز ، ١٩٢٧ .
(٦٧) دیوانی گۆران ، سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٨٠ .
(٦٨) دیـوانی مەحـوی ، لێکدانـەوە و لێکۆڵینـەوەی : مـەلا عـەبـدولکـەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم ، بەغدا ، ١٩٧٧ .
(٦٩) ڕەئـووفی ئەحـمـەد ئالانی ، دواوانێـك بۆ ڕێنـووسی کوردی ، ڕۆژنـامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، بەشی یەکەم ، ژ ٤٦٩ ، ل ٦ ـ ٧ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٤٧١ ، ل ٣ ؛ بەشی سێیەم ، ژ ٤٧٢ ، ل ٣ ، ٧ .
(٧٠) ڕەئووفی ئەحمەد ئالانی ، ڕێنووسی کوردی و چەند هەڵوێستێك ، ڕۆژنامەی « هاوکاری » ، بەغدا ، ١٩٧٩ ، بەشی یەکەم ، ژ ٤٧٨ ، ل ٣ ؛ بەشی دووەم ، ژ ٤٧٩ ، ل ٢ ؛ بـەشی سێیـەم ، ژ ٤٨٥ ، ل ٣ ؛ بـەشی چوارەم ، ژ ٤٩٠ ، ل ٣ .
(٧١) ع . ڕەحمی ، لوما ژ بلبل ، گۆڤاری « ژین » ، ژ ١٩ ، ئەستـەموول ، ٢٢ ی مایسی ١٣٣٥ ك / ٢٢ ی مایسی ١٩١٩ ، ل ١٦ .
(٧٢) ڕەفیق حیلمی ، بۆ کوردان ، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، ساڵی ١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ .
(٧٣) ڕۆژی کوردستان ، سلێمانی ، ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ (کۆکردنەوە و پێشەکی : جەمال خەزنەدار) ، بەغدا ، ١٩٧٣ .

(٧٤) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(٧٥) زەکی صائیب ، مەسەلەی مەکتەب کردنەوە ، رۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، سالی ١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ ـ ٣ .
(٧٦) س . ، گیرەشێوێنی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٦ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٠ .
(٧٧) سەعید صدقی ، مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ .
(٧٨) سەید نووری بەرزنجی و سەید فەتاح بەرزنجی ، قرائت ، جزمی دووەمین ، چاپی یەکەمین ، بەغدا ، ١٩٢٧ .
(٧٩) سەید نووری بەرزنجی و سەید فەتاح بەرزنجی ، قرائت ، جزمی سێیەمین ، چاپی یەکەمین ، بەغدا ، ١٩٢٨ .
(٨٠) شاکیر فەتتاح ئەحمەد ، گیروگرفتەکانی رێنووسی کوردی و شێوەی چارەکردنیان ، « گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١١٢ ـ ١٣٤ .
(٨١) شەریف یوسف و . . . « حساب و پێوان بۆ پۆلی شەشەم » ، رەشید نەجیب کردوویە بە کوردی ، چاپی سێیەم ، بەغدا ، ١٩٥٦ .
(٨٢) ع . ع . شەونم ، دەستووری نووسینی کوردی ، گۆڤاری « برایەتی » ، ژ ٢ ، سالی ١ ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، ل ٣٢ ـ ٣٥ .
(٨٣) شوکور مستەفا ، نقتك دانین (لە ئەلفوبێی سلاڤی یەوە هێناویەتە سەر ئەلفوبێی عەرەبی) ، « گۆڤاری کۆری زانیاری کورد » ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل ٣٠٣ ـ ٣١٨ .
(٨٤) شێخ حەسەن ، رەخنەیەکی زانستی لە مامۆستای بەرێز جەمیل رۆژبەیانی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٤ ـ ٨ .
(٨٥) شێخ حەسەن ، (ی)ی ئیزافە و (واوی عەتف) ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، سالی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١٥ ـ ١٦ .
(٨٦) صادق بەهائەدین ئامێدی ، رێنڤیسینا کوردی ب تیپێت عەرەبی ، « گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٣٥ ـ ١٤٨ .

(٨٧) طاهیر صادق ، ڕێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی ، کەرکووك ، ١٩٦٩ .
(٨٨) طاهیر صادق ، ڕێنووسی کوردی ، «گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد» ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٤٩ ـ ١٧٣ .
(٨٩) طاهیر صادق ، هەڵەی نووسین ، گۆڤاری «ڕۆژی نوێ» ، ژ ٣ ، ساڵی ٢ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ٦٥ ـ ٦٧ .
(٩٠) ع . ئیملای کوردی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ٥ ـ ٦ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٤٠ ، ل ١ ـ ٦ .
(٩١) عادیل عیرفان ، هەڵەقۆکردن بە نووسینی کوردی و وشەی عەرەبی ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٨ ـ ٢٠ .
(٩٢) عەبدولرەحمان سەعید ، کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ، بەغدا ، ١٩٢٥ .
(٩٣) عەبدولعەزیز خانەقا ، جوابی پرسیاری گەلاوێژ ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١١ ، ساڵی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٦ .
(٩٤) عەبدوڵڵا زێوەر ، فەرهەنگی عەرەبی ـ کوردی ، سلێمانی ، ١٩٤١ (دەستنووس) .
(٩٥) عەبدوڵڵا نەقشبەندی ، پاشکۆی (درا) ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ١١٥ ـ ١٢٧ .
(٩٦) عەرەب شەمۆ ، دمدم ، (شوکور مستەفا کردویە بە کرمانجیی خواروو) ، بەغدا ، ١٩٧٥ .
(٩٧) عەلائەدین سەجادی ، دانانی نیشانەکانی پیتی کوردی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ١٢ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦١ ، ل ١١ ـ ١٨ .
(٩٨) عەلائەدین سەجادی ، دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی ـ عەرەبی ـ فارسی ، بەغدا ، ١٩٦٢ .
(٩٩) عەلائەدین سەجادی ، مێژووی ئەدەبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٢ .
(١٠٠) عەلائەدین سەجادی ، ناوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٥٣ .
(١٠١) عەلی کەمال باپیر ، تەربیەی ئەولاد ، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، ساڵی ١ ، ژ ٥ ، ٤ ی ئەیلولی ١٩٢٢ ، ل ٢ ـ ٣ .

(١٠٢) عوسمان صەبری ، پرسیارا گەلاوێژی ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١ ، ساڵی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ٥٨ ـ ٦٠ .
(١٠٣) عومەر عەبدولڕەحیم ، ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٧٤ ـ ١٨٥ .
(١٠٤) فوئاد زەکی هەناری ، نووسینی تیپی (دال) بە شێوەی سلێمانی ، گۆڤاری « هیوا » ، ژ ٧ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ١٩ ـ ٢١ .
(١٠٥) قانوونی هەڵبژاردن ، بەغدا ، ١٩٢٥ .
(١٠٦) قەدری جان ، وەرام ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١١ ، ساڵی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٤ ـ ٥٥ .
(١٠٧) د. کامیل بەسیر ، خاڵبەندی بۆ ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٥ ـ ١٥ .
(١٠٨) د. کەمال فوئاد ، چەند سەرنجێکی زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٥٨ ـ ٥٩ .
(١٠٩) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ، « تێگەیشتنی ڕاستی » و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ .
(١١٠) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد ، مێژوو ـ کورتەباسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو ، بەغدا ، ١٩٨٣ .
(١١١) « کوردستان » یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢ ، کۆکردنەوە و پێشەکی : د. کەمال فوئاد ، بەغدا ، ١٩٧٢ .
(١١٢) کوردستان موکریانی ، ئامرازەکانی خستنەسەر لە زمانی کوردیدا ، « گۆڤاری زانکۆ » ، ب ٤ ، ژ ١ ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ل ١٤٥ ـ ١٧٤ .
(١١٣) کوردستان موکریانی ، چۆنیەتی نووسینی چاوگەی نەسادە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ١٨٦ ـ ٢١١ .
(١١٤) کوردی و مەریوانی ، دیوانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٣١ .
(١١٥) کۆڕی زانیاری کورد ، ڕێنووسی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ١ ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٤٦ ـ ٣٧٩ .

(١١٦) ع . گۆڤان ، نووسینی کوردی بە تیپی لاتینی ، گۆڤـاری « گەلاوێـژ » ، ژ ٢ ، ساڵی ٥ ، بەغدا ، ١٩٤٤ ، ل ١ ـ ٤ .
(١١٧) گیوی موکریانی ، ئەلفوبێی وێنەدار بە تیپی لاتینی ، هەولێر ، ١٩٧٢ .
(١١٨) م . م . (محەمەدی مـەلا کەریم) ، نـووسینی زمانی کـوردی ، گۆڤـاری « هیوا » ، ژ ٨ ، ساڵی ١ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٩ ـ ١٤ .
(١١٩) د. مارف خەزنەدار ، دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .
(١٢٠) مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٦ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ٢٣ ـ ٢٦ .
(١٢١) مارف خەزنەدار ، زمانەوانی ، گۆڤاری « ڕۆژی نوێ » ، ژ ٨ ، ساڵی ١ ، سلێمانی ، ١٩٦٠ ، ل ١٣ ـ ١٨ .
(١٢٢) مستەفا پاشا ، ئەحواڵی ضابطانی کورد ، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، ساڵی ١ ، ژ ٤ ، ٢٨ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ ـ ٢ .
(١٢٣) مستەفا پاشا ، جەمعیەتی کوردستان ، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، ساڵی ١ ، ژ ١ ، ٢ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ ـ ٣ .
(١٢٤) مستەفا پاشا ، حەساب ساڵی دووەم، ڕۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، ساڵی ١ ، ژ ٣ ، ٢١ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ ـ ١٢ .
(١٢٥) مستەفا نەریمان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٧ .
(١٢٦) مستەفا نەریمان ، ڕێنووسی کوردی لە ڕەگ و ڕیشەوە ، بەغدا ، ١٩٨١ .
(١٢٧) مستەفا نەریمان ، مامۆستای نەمر ، بەغدا ، ١٩٧١ .

(١٢٨) محەمەد ئەمین هەورامانی ، ڕێنووس پەیرەوی زمانناسی بکا باشە ، گۆڤاری « ئاسۆی زانکۆیی » ، سلێمانی ، ١٩٧٨ ، ژ ١٠ ، ل ٨٨ ـ ٩١ .
(١٢٩) محەمەد ئەمین هەورامانی ، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بـەراوردا ، بەغدا ، ١٩٨١ .
(١٣٠) محەمەد ئەمین هەورامانی ، فۆنەتیکی زمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٤ .
(١٣١) محەمەد بەهجەت ئەل‌ئەسەری و . . . ، کتێبی « خوێندنەوەی کوردی بۆ پۆلی سێیەم » ، عەبدولخالق قوتب کردوویە بە کوردی ، چاپی پێنجەم ، بەغدا ، ١٩٥٥ .

(١٣٢) محەمەد صالح سەعید ، جارێکی تریش پیتەکانی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٤ ، بەغدا ، ١٩٧١ ، ل ٦٤ ـ ٧٠ .
(١٣٣) محەمەد صالح سەعید ، فرێدان و هەڵبواردن لە بەکارهێنان و نووسینی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢١٢ ـ ٢٢٨ .
(١٣٤) محەمەد مەعرووف فەتتاح ، نووسینی کوردی لە ڕوانگەی فۆنەتیکەوە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٢٩ ـ ٢٦٧ .
(١٣٥) محەمەدی مەلا کەریم ، « ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا » لەبەر ڕووناکیی ڕەخنەدا ، گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، ژ ٤٣ ـ ٤٤ ، بەغدا ، ١٩٧٧ ، ل ٥٣ ـ ٥٦ .
(١٣٦) محەمەدی مەلا کەریم ، لەگەڵ ڕابەرەکەی کاك نووری عەلی ئەمیندا ، ڕۆژنامەی « برایی » ، ژ ٧ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل ٤ ـ ٥ ؛ ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل ٢ ؛ ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ل ٢ ؛ ژ ١٠ ، بەغدا ، ١٩٦٧ ، ل ٢ ، ٧ .
(١٣٧) محەمەدی مەلا کەریم ، هەنگاوێکی تر بە ڕێگای دانانی دەستوورێکدا بۆ نووسینی کوردی ، گۆڤاری « نووسەری کورد » ، ژ ٨ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧ ـ ١٢ .
(١٣٨) محی ئەدین یوسف ، سەعید صەفو ، « حساب و قیاسات بۆ پۆلی پێنجەمی سەرەتایی » ، فوئاد ڕەشید کردوویە بە کوردی ، بەغدا ١٩٥٦ .
(١٣٩) مەحموود حەسەن ، وەڵامی پرسیاری گەلاوێژ ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ، ژ ١١ ، ساڵی ٤ ، بەغدا ، ١٩٤٣ ، ل ٥٧ .
(١٤٠) مەسعوود محەمەد ، بەکارهێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٣٩ ـ ١١٤ .
(١٤١) مەسعوود محەمەد ، چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی ڕێنووس و ئەلفوبێی کوردی ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٢٦٨ ـ ٣٥٩ .

(١٤٢) مەسعوود محەمەد ، چەند حەشارگەیێکی ڕێزمانی کوردی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(١٤٣) مەسعوود محەمەد ، ڕەواندنەوەی دوو ڕەخنە ، گۆڤاری « ڕۆشنبیری نوێ » ، بەغدا ١٩٨٠ ، ژ ٨٠ ، ل ٢ ـ ٨ .
(١٤٤) مەسعوود محەمەد ، ڕێنووسی کۆڕ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٤ ، بەغدا ١٩٧٦ ، ل ٢٣٢ ـ ٢٨٨ .
(١٤٥) مەسعوود محەمەد ، فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ب ٣ ، ژ ١ ، بەغدا ١٩٧٤ ، ل ٥٦٨ ـ ٦٢٢ .

(١٤٦) مەسعوود محەمەد ، گیروگرفتی ڕێنووسی کوردی ، گۆڤاری « پەروەردەو زانست » ، ژ ٦ ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل ٧ ـ ٢٨ .
(١٤٧) مەعرووف جیاوك ، بەرگی ئیملای کوردی ، بەغدا ، ١٩٣٠ .
(١٤٨) مەلا ڕەشید بەگی بابان ، اقتران النيرين في مجمع البحرين (ئامادەکردن و پێشکەش کردن و لەسەر نووسینی : محەمەد عەلی قەرەداغی) ، بەغدا ، ١٩٧٣ .
(١٤٩) مەلا عەبدولکەریم مودەڕڕیس و فاتیح عەبدولکەریم ، دیوانی نالی ، بەغدا ، ١٩٧٦ .
(١٥٠) مەلا محەمەدی سیوچی ، تذكرة العوام یان بەیتی ئەووەڵ و ئاخر (لێکۆڵینەوەی : محەمەد عەلی قەرەداغی) ، سلێمانی ، ١٩٧٩ .
(١٥١) ن . ، دیسانەوە (ئەلفوبێی نوێ دانەری ئیبراهیم باڵدار) و بەراوردی ڕەخنە زانستییەکەی مامۆستا مستەفا صالح کەریم و وەڵامەکەی مامۆستا ئیبراهیم ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ، ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٥٨ ، ل ٤ ـ ٦ .
(١٥٢) د. نەسرین فەخری ، پەرەسەندنی واتای وشە و دەوری لەدەوڵەمەندکردنی زماندا ، گۆڤاری « الاستاذ » ژ ٢ ، بەغدا ، ١٩٧٨ ـ ١٩٧٩ ، ل ٦٤٣ ـ ٦٧١ .
(١٥٣) د. نەسرین فەخری ، پێشەکی چۆن بنووسین ؟ لە دەنگەوە بۆ وشە ، تا ڕستە ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٢٠ ـ ٤٣٣ .

(١٥٤) د. نەسرین فەخری ، چاوگی بێواتا لە زمانی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٣ .
(١٥٥) ع . و . نووری ، پیرۆزیی منالْ ، سلێمانی ، ١٩٤٠ .
(١٥٦) ع .و . نووری ، لە ولآتی ئادەمیزادە سەربەستەکان ، بەغدا ١٩٣٩ .
(١٥٧) م . نووری ، مەکینەی چاپ ، رۆژنامەی « بانگی کوردستان » ، سالْی ١ ، ژ ٣ ، ٢١ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ ـ ٤ .
(١٥٨) نووری عەلی ئەمین ، رابەرێ بۆ ئیملای کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٦ .
(١٥٩) نووری عەلی ئەمین ، رێزمانی کوردی ، سلێمانی ، ١٩٦٠ .
(١٦٠) نووری عەلی ئەمین ، گیروگرفتی نووسینی کوردی لە تای ترازووی پیتە بزوێن و نەبزوێندا ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٣٦٠ ـ ٤١٩ .
(١٦١) نووسینی کوردی ، رۆژنامەی « زبان » ، ژ ١ ، سالْی ١ ، سلێمانی ، ١٩ ی ئەیلولی ١٩٣٧ ، ل ١ .
(١٦٢) أ . ب . هەوری ، دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی ، سلێمانی ، ١٩٦٨ .
(١٦٣)وردی ، دەستووری زمانی کوردی ، گۆڤاری « گروگالْی منداڵانی کورد » ، ژ ٦ ، پووشپەڕی ١٣٢٥ / حوزەیرانی ١٩٤٦ ، ل ٣ .
(١٦٤) د. وریا عومەر ئەمین ، ئیملای کوردی و چەند تێبینییەك ، « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ، ب ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ ، ل ٤٣٤ ـ ٤٤٩ .

**بە زمانی عەرەبی**

(١٦٥) ابو زيد مصطفى السندى ، الكلمات العربية في اللغة الكردية ، « مجلة المجمع العلمي العراقى ـ الهيئة الكردية » ، المجلد ٩ ، بغداد ، ١٩٨٢ ، ص ٤٨٩ ـ ٥١٠ .
(١٦٦) احمد زكى باشا ، الترقيم و علاماته في اللغة العربية ، مصر ، ١٩١٢ .

(١٦٧) توفيق وهبي ، حول مقال مسؤولية الاديب الكردى الكبرى للاستاذ عبدالمجيد لطفى ، مجلة « پەروەردە و زانست ـ التربية والمعرفة » ، العدد ٥ ، بغداد ، ١٩٧٣ ، ص ٨١ ـ ٩١ .

(١٦٨) توفيق وهبي ، قواعد اللغة الكردية ، الجزء الاول ، بيروت ، ١٩٥٦ .

(١٦٩) رشاد المغربي ، تيسير اللغة العربية ، صيدا ، ١٩٥١ .

(١٧٠) د. عزالدين رسول ، حول المجمع العلمي الكردي ، مجلة «الثقافة» ، بغداد ، ١٩٧٦ ، العدد ٤ ، ص ١٤٦ ـ ١٧٠ .

(١٧١) أ . كوندراتوف ، اصوات و اشارات (نقله عن الانكليزية : ادور يوحنا) ، بغداد ، ١٩٦٩ .

(١٧٢) مجمع فؤاد الاول للغة العربية، تيسير الكتابة العربية ، القاهرة ، ١٩٤٦ .

(١٧٣) مجمع اللغة العربية بالقاهرة ، تيسير الكتابة العربية ، القاهرة ، ١٩٦١ .

(١٧٤) محمد تيمور ، ضبط الكتابة العربية ، القاهرة ، ١٩٥١ .

(١٧٥) محمد طاهر بن عبدالقادر الكردى ، حول تيسير الكتابة العربية ، مكة ، ١٣٦٥ هـ .

(١٧٦) محمد الملا عبدالكريم ، عالم كردى من الاتحاد السوفياتى يؤلف « ابجدية لصداقة الشعوب » ، جريدة « التآخى » ، العدد ، ١٢٦١ ، ١٨ شباط ١٩٧٣ ، ص ٨ .

(١٧٧) نريمان ، سبق كردى اخر لابجدية عالمية اخرى ، جريدة « التآخى » ، العدد ، ١٢٧١ ، ١ أذار ١٩٧٣ ، ص ٦ .

(١٧٨) يونس عبدالرزاق السامرائى ، تيسير الكتابة العربية ، بغداد ، ١٩٥٥ .

**به زمانی توركی**

(١٧٩) م . ص . آزيزى ، حروفمز و تسهيل قرائت ، گۆڤاری « ڕۆژی كورد » ، ژ ٢ ، ئەستەمووڵ ، ٦ ی تەمووزی ١٣٢٩ ك / ١٩١٣ ز ، ل ١٢ ـ ١٣ .

(١٨٠) (تعميم معارف و اصلاح حروف) جمعيت محترمەسی طرفندن وارد اولمشدر : روژ كرد مجموعەسی مديريت عليە سنه ، گۆڤاری « ڕۆژی كورد » ، ژ ٢ ، ئەستەمووڵ ، ٦ ی تەمووزی ١٣٢٩ ك / ١٩١٣ ز ، ل ١٣ ـ ١٦ .

## بە زمانی ڕووسی


(١٨١) س . ئی . ئاباکوموڤ ، کێشەی لێکۆڵینەوەی خاڵبەندی ، گـۆڤاری « زمانی ڕووسی لە قوتابخانەدا » ، ژ ٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٤٧ ، ل ٢١ .
(١٨٢) ك . ئەیووبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگرد ، ١٩٦٨ .
(١٨٣) ڤ . ئا . ئیسترین ، گەشەکردنی نووسین ، چاپی یەکەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
(١٨٤) ڤ . ف . ئیڤانۆڤا ، سەرەتایێکی خاڵبەندیی ڕووسی ، لێنینگراد ، ١٩٦٢ .
(١٨٥) ب . ز . بوکچینا ، ل. پ . کەلاکوتسکایا ، ل. ك. چێلتسۆڤا ، نامە دەربارەی ڕێنووس ، مۆسکو ، ١٩٦٩ .
(١٨٦) س . گ . بەرخوردارۆڤ و . . . ، دەستووری خاڵبەندیی ڕووسی ، کتێبی « کێشەی ڕێنووسی ڕووسی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٥ ـ ٦٨ .
(١٨٧) ك . ئی . بیلینسکی ، د. ی . ڕۆزێنتال ، حاڵەتی گرانی خاڵبەندی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٩ .
(١٨٨) ن . س . پۆسپێلۆڤ ، دەربارەی خاڵبەندی لە شیعری پوشکیندا ، کتێبی « شێواز و زمانی پوشکین » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٧ ، ل ١١٥ ـ ١٢٣ .
(١٨٩) م . ڤ . پەنۆڤ ، زمانی ڕووسی ئەمڕۆ (فۆنەتیك) ، مۆسکو ، ١٩٧٩ .
(١٩٠) ئا. م . پیشکۆڤسکی ، دەوری خوێندنەوەی باش لە فێرکردنی نیشانەکانی خاڵبەندیدا ، « کارە هەڵبژاردەکانی » ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ .
(١٩١) ڤ . ئا . ترۆفیمۆڤ ، زمانی ئەدەبیی ئەمڕۆی ڕووسی (فۆنەتیك و ڕێنووس) ، لێنینگراد ، ١٩٥٧ .
(١٩٢) د. ئێ . ڕۆزێنتال ، کێشەی ڕێنووسی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .
(١٩٣) د. ئێ . ڕۆزێنتال ، کێشەی نووسینی وشەی لێکدراو ، کتێبی « کێشەی ڕێنووسی ڕووسی » ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ، ل ٢٣ ـ ٣٦ .
(١٩٤) ئا . ئا. ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٧ .

(١٩٥) ئـا . ف . سوپێـرانسکايـا ، نووسينی وشـەی بێگانـە لە زمـانی ڕووسی ئەمڕۆدا ، کتێبی « کێشەی ڕێنووسی ڕووسی ئەمڕۆ » ، مۆسکۆ ١٩٦٤ ، ل ٦٩ ـ ١٠٠ .
(١٩٦) ئا . ب . شەپیرۆ، بنچینەی خاڵبەندیی ڕووسی ، مۆسکۆ، ١٩٥٥ .
(١٩٧) ئا . ب. شەپیرۆ ، ڕێنووسی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
(١٩٨) گ . پ . فیـرسۆڤ ، دەربـارەی خوێنـدنی سینتاکس و خـاڵبەنـدی لە قوتابخانە ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ .
(١٩٩) ئی . ئا . فیگورۆڤسکی ، خاڵبەندیی تێکستێکی سەرلەبەر ، گـۆڤاری « زمانی ڕووسی لە قوتابخانەدا » ، مۆسکۆ ، ١٩٣٦ ، ژ ٥ .
(٢٠٠) ق . کوردۆ ، دەستووری زمانی کوردی (بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو) ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .
(٢٠١) ڤ. ئی . کۆدۆخۆڤ ، سەرەتایێکی زمانناسی ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .
(٢٠٢) یا . ك . گرۆت ، ڕێنووسی ڕووسی ، پێتربورگ ، ١٨٨٥ .
(٢٠٣) ئـا . ن . گڤۆزدێڤ ، دەستـووری نووسـین و خـاڵبـەنـدیی ڕووسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ .
(٢٠٤) ب . ن . گۆلۆڤین ، سەرەتایێکی زمانناسی ، چاپی دووەم ، مۆسکۆ ، ١٩٧٨ .
(٢٠٥) ئا . ئی . مەیسێڤ ، پیت و دەنگ ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ .

## فرەزمان و فەرهەنگ

(٢٠٦) ئۆ . س . ئاخمانۆڤا، فەرهەنگی زاراوەکانی زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ .
(٢٠٧) تـۆفیق وەهبی و س . ئەدمـۆنس ، فەرهـەنگی کـوردی ـ ئینگلیـزی ، لەندەن ، ١٩٦٦ .
(٢٠٨) دیوانی مەولانا خالید ، ئەستەموول ، ١٢٦٠ ك / ١٨٨٤ ز .
(٢٠٩) م . ب . ڕودێنکـۆ ، « عادات و رسـومات نـامـەی اکـرادیـە » ی مـەلا مەحموودی بایەزیدی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣ .
(٢١٠) م . ب . ڕودێنکۆ ، « لەیل و مەجنوون » ی حارسی بتلیسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦٥ .

(٢١١) ئا . ژابا ، جامع‌ یی رساليان وحكايتان بزمانی كورمانجی ، پيترسبورگ ، ١٨٦٠ .
(٢١٢) ش . سامی ، قاموس تركی ، استمبول ، ١٣١٧ هـ .
(٢١٣) شێخ محەمەدی خاڵ ، فەرهەنگی خاڵ ، سلێمانی ، ب ١ ، ١٩٦٠ ؛ ب ٢ ، ١٩٦٤ ؛ ب ٣ ، ١٩٧٦ .
(٢١٤) شێخ محەمەدی مەردۆخ ، فەرهەنگی « مەردۆخ » ، تاران ، ١٩٥٦ .
(٢١٥) عەبدوڵڵا زێوەر ، فەرهەنگی عەرەبی - كوردی ، سلێمانی ، ١٩٤١ (دەستنووس) .
(٢١٦) ق . كوردۆ ، فەرهەنگی كوردی - رووسی ، مۆسكۆ ، ١٩٦٠ .
(٢١٧) نشريات هيوی جوانا طلبة كوردان ، هينكر زمان كوردی ، چاپخانەی نجم استقبال ، باب عالی ، ابو السعود ، ١٩٢١ .
(٢١٨) يوسف ضياء الدين باشا الخالدي المقدسی ، الهدية الحميدية في اللغة الكردية ، استانبول ، ١٣١٠ هـ / ١٨٩٣ م.

## به زمانه رۆژئاواييه‌كان

(٢١٩) D. Abercrombie , What is a Letter ((Lingua)) , 1949 , Vol . 2 , No . 1. ?.

(٢٢٠) Fr. Ballhorn , Grammatography. A Manual of Reference to the Alphabets of Ancient and Modern Languages , London, 1861.

(٢٢١) R. A. Jr. Hall , Graphemics and Linguistics- ((Symposium on Language and Culture, Proceedings of the 1962 Annual Spring Meeting of the American Ethnological Society)) , Univ . of Washington, 1963.

(٢٢٢) L. O. Fossum , A Practical Kurdish grammar , Minneapolis , 1919.

(٢٢٣) Maurizio Garzoni , Grammatica e Vocabolario della lingua Kurda , Roma , 1878 .

(٢٢٤) A . McIntosh , Graphology and Meaning — ((Patterns of Language)) , London , 1966 .

(٢٢٥) F . Smith Alphabetic Writing — a language compromise ? — ((Psycholinguistics and reading)) , ed by F . Smith , New — York, 1973.

(٢٢٦) E . B. Soane . Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language , London , 1913 .
(٢٢٧) E . B . Soane , Elementary Kurmanji Grammar , Baghdad, 1919.

## رۆژنامه و گۆڤار

(٢٢٨) «ئۆگۆنیۆك» ، ژ ٤ ، مۆسكو ، ١٩٥٧ .
(٢٢٩) «بانگی كوردستان» ، سلێمانی ، ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ .
(٢٣٠) «پەیام» ، بەغدا ، ١٩٥٢ ـ ١٩٥٦ .
(٢٣١) «پێشكەوتن» ، بەغدا ، ١٩٥٨ .
(٢٣٢) «پێشكەوتن» ، سلێمانی ، ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢ .
(٢٣٣) «تێگەیشتنی راستی» ، بەغدا ، ١٩١٨ ـ ١٩١٩ .
(٢٣٤) «رۆژی كوردستان» ، سلێمانی ١٩٢٢ ـ ١٩٢٣ .
(٢٣٥) «زاری كرمانجی» ، رەواندز ، ١٩٢٦ ـ ١٩٣٢ .
(٢٣٦) «زبان» ، سلێمانی ، ١٩٣٧ ـ ١٩٣٨ .
(٢٣٧) «ژین» ، ئەستەموول ، ١٩١٩ .
(٢٣٨) «شەفەق» ، كەركووك ، ١٩٥٨ .
(٢٣٩) «كوردستان» ، ئەستەموول ، ١٩١٩ .
(٢٤٠) «كوردستان» ، قاهیرە ، جنێف . . . هتد ، ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢ .
(٢٤١) «گروگاڵی مندالآنی كورد» ، مەهاباد ، ١٩٤٦ .
(٢٤٢) «گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد» ، ب ١ . ژ ١ ، بە غدا ، ١٩٧٣ ؛ ژ ٩ ، بەغدا ، ١٩٨٢ .
(٢٤٣) «هەتاو» ، هەولێر ١٩٥٣ ، ژ ١ .
(٢٤٤) «هیوا» ، بەغدا ، ١٩٥٧ .

●
●
●

## ناوەرۆك

« دیاری کوردستان » ل ٣٦ ، رۆژنامەی « پێشکەوتن » ل ٣٧ ، رۆژنامەی « رۆژی کوردستان » ل ٣٧ ، رۆژنامەی « بانگی کوردستان » ل ٣٧ ، کتێبی « هێکرۆهان کوردی » ل ٣٨ ، کتێبی « کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی » و « قانوونی هەڵبژاردن » ل ٤١ ، کتێبی « مختصر صرف و نحوی کوردی »ی سەعید صدقي ل ٤١ ـ ٤٢ ، کتێبی « دەستووری زمانی کوردی »ی تۆفیق وەهبی ل ٤٣ ـ ٤٦ ، نامیلکەی « بەرگی ئیملای کوردی »ی مەعرووف جیاوك ل ٤٧ ، کتێبی « ئەلفوبێی کوردی »ی حامید فەرەج ل ٤٨ ، « ئەلفبای کوردی »ی ئەحمەدی عەزیزئاغا ل ٤٨ ، مەلا رەشید بەگی بابان ل ٤٨ ـ ٥٠ ، گۆڤاری « گەلاوێژ » ل ٥٠ ـ ٥٢ ، گۆڤاری « گروگاڵی منداڵانی کورد » ل ٥٢ ـ ٥٣ ، کتێبی « ئەلفوبێ » و « ئەلفوبێی نوێ بۆ منداڵان » و « ئەلفوبێ بۆ گەورە » . . . ی ئیبراهیم بالدار ل ٥٣ ـ ٥٤ ، دەوری ئیبراهیم ئەحمەد و عەلائەدین سەجادی ل ٥٤ ـ ٥٨ ، گۆڤاری « پەیام » ل ٥٧ ـ ٥٨ ، کتێبی قوتابخانەکان ل ٥٨ ، گۆڤاری « هیوا » ل ٥٩ ـ ٦٠ ، گۆڤاری « رۆژی نوێ » ل ٦٠ ـ ٦١ ، گۆڤاری « پێشکەوتن » ل ٦١ ـ ٦٢ ، گۆڤاری « شەفەق » ل ٦٢ ـ ٦٣ ، کتێبی « رابەرێ بۆ ئیملای کوردی »ی نووری عەلی ئەمین ل ٦٣ ـ ٦٥ ، نامیلکەی « دەستووری نووسینی زمانی کوردی بە پیتی عەرەبی »ی أ . ب . هەوری ل ٦٥ ، کتێبی « رێنووس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی »ی طاهیر صادق ل ٦٥ ـ ٦٦ ، رێنووسی کۆڕی زانیاری کوردل ٦٦ ـ ٧٣ ، وتارەکانی مەسعوود محەمەد لەبارەی رێنووسی کوردییەوە ل ٧٣ ـ ٧٥ ، ئەو وتارانەی لە گۆڤارو رۆژنامە کوردییەکانی نێوان ساڵانی ٧٠ ـ ٨٠ دا لەبارەی رێنووسی کوردییەوە بلاوکراونەتەوە ل ٧٥ ـ ٧٦ ، بەرگی نوێیەمی « گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ـ دەستەی کورد » ل ٧٦ ـ ٧٩ ، ئەنجام ل ٧٩ ـ ٨٠ .

پڕ بە دڵ سوپاسی مامۆستا سەردار میران و مامۆستا عەزیز حەریری و مامۆستا جەعفەر بەرزنجی ، سێ برا و هاورێی نێزیکم دەکەم ، کە لە دەرکردنی ئەم کتێبەدا زۆریان هاریکاری لەگەڵ کردم و یاریدەیان دام .

له چاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتیی رۆشنبیریی و لاوانی
ناوچەی کوردستان

# له بواری فەرهەنگ نووسیی کوردیدا



دوکتۆر
ئەورەحمانی حاجی مارف

بەغـــدا – ١٩٨٧

# پێشـــــەکی

مەسەلەی دانانی فەرهەنگ گرنگ و گرانە ، بۆیە تاکو ئێستا گەلێ کێشـەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسیی پێویستی بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەیە .

ساڵی ١٩٤٠ زانای بەناوبانگی ڕووس ل . ف . شێربا یەکەم وتاری دەربارەی فەرهەنگ‌نووسیی بڵاوکردەوە ، کە تێیدا لەسەر کەرەستەیەکی زۆرو فراوان کێشـە سەرەکییەکانی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسیی دیاری کردووە[1] . ئەگەرچی مەرگ بووە بەرهەڵستی ئەوەی شێربا بتوانێ گشت نووسینەکانی لەپارەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسییەوە بگەیەنێتە ئەنجام ، بەڵام فریاکەوت ئەوە بچەسپێنێ کە وا فەرهەنگ‌نووسیی تەنها کاری پراکتیکی دانانی فەرهەنگ نییەو بەڵکو کارێکی زانستی و تیۆریشە . ئەمەش لەبنو قوتابخانەی فەرهەنگ‌نووسیی سۆڤیەتدا ڕەگی داکوتا .

زمانەوانانی سۆڤیەت بەدوا ل . ف . شێربادا لەوەوە بۆ مەسەلەکە دەچن : کە وا فەرهەنگ‌نووسی وەك زانستێك دوو دیوی هەیە : تیۆری و پراکتیك[2] . یەکەمیان لەو کێشانە دەکۆڵێتەوە کە لە دانانی

(١) ل . ف . شێربا ، تەجروبەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسیی ، « هەواڵەکانی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیەت » ، ١٩٤٠ ، ژ ٣ .

(٢) گ . ف . ستیپانۆڤ ، پێشەکی بۆ تەرجومەی ڕووسی کتێبی « سەرەتایێك بۆ فەرهەنگ‌نووسیی ئەمرۆ »ی ( خ. کاسارێس ) ، ل٩ .

هەر فەرهەنگێکدا سەرهەڵدەدەنو لە ڕێگای زانستی‌یەوە ڕێگاو ڕێبازی ڕاست بۆ چارەسەرکردنیان دەدۆزێتەوە . دووەمیش ـ لەسەر بناغەی ئەو تیۆری‌یەو لەبەر ڕووناکیی ئەو ڕێگەو ڕێبازەی بۆی دانراوە کاری دانانی فەرهەنگ بەجێدەگەیەنێ . بێ‌گومان دابەش‌کردنی فەرهەنگ‌نووسی بەسەر دوو لایەندا شتێکی ڕاستە . ئەو دوو لایەنەی فەرهەنگ‌نووسی هەمیشە شان‌بەشانی یەکتر دەڕۆنو تێک‌ئاڵاون . « پسپۆڕی فەرهەنگ‌نووسی تەنیا بە خەریك‌بوونی بە تیۆریی ڕووت‌و کارنەکردنی لەسەر کەرەستەی خاوو خۆتاقی‌نەکردنەوە بە دانانی فەرهەنگەوە ... سەرناکەوێ . بەپێچەوانەشەوە هیچ فەرهەنگ نووسێك ئەگەر وەك زانستێك زانیاری لە کێشە گرنگەکانی فەرهەنگ‌نووسیدا پەیدا نەکا ، ڕاست نیە خۆی بهاوێتە دەریای فەرهەنگ دانانەوە . جا لە یەك کاتدا بایەخدان بە هەردوو بنکەی فەرهەنگ‌نووسی ، زۆر پێویستە »[٣] .

ئەگەرچی لە وڵاتە پێشکەوتووەکان بە دەیان نامەی دوکتۆری‌و کتێب ؛ بە سەدان وتارو لێکۆڵینەوە لەبارەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسییەوە بڵاوکراونەتەوەو چەندین کۆنگرەی بۆ بەستراوەو گەلێ گۆڤاری تایبەتی بۆ تەرخان کراوەو ئامۆژگای بۆ دامەزراوە ، بەڵام دەتوانین بڵێین لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا گەلێ کێشەی دانانی فەرهەنگ نەك هەر ساغ‌نەکراوەتەوە ، بەڵکو پەنجەشی بۆ درێژنەکراوە .

هەموو ئەمە بەسەریەکەوە ، ئەگەرچی هێشتا تیۆریی تەواوو کاملی فەرهەنگ‌نووسی لێ‌پەیدانەبووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو

(٣) ل . پ . ستوپین ، بارو بنکەی تۆژەرانی سۆڤێت لەبارەی فەرهەنگ‌نووسیی ئەورووپاو ئەمەریکاوە ، « هەواڵەکانی زانکۆی لێنینگراد » ، ١٩٦٧ ، ژ ٢٠ ، ل ١٦١ .

تیۆرییە گرنگانەی لە کاری فەرهەنگ‌نووسیدا پێویستە ڕەچاوبکرێن ، نیشاندەدەن .

لەم بارەیەوە ئەوەی پێوەندی بە کاری دانانی فەرهەنگی کوردییەوە هەیە ، لەگەڵ ئەوەشدا کە مێژوویەکی کۆنی هەیە ، کەچی هیچ باس‌و کەرەستەیەکی تیۆری دەربارەی نەنووسراوە . جا لەو ڕایەدام کە لێدوان‌و لێکۆڵینەوە لە فەرهەنگە کوردییەکان نەك هەر دەبێتە ڕابەرو ڕێ‌نیشاندەری فەرهەنگ‌نووسەکان ، بەڵکو دەشبێتە سەرچاوەی سەرهەڵدان‌و گەشەکردنی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی ... بۆیە لەو وتارانەدا ، کە لە سەرەتای ساڵانی حەفتاوە تا ئەمڕۆ لەبارەی فەرهەنگە کوردییەکانەوە بڵاومان‌کردۆتەوە ، هەوڵمان‌داوە لە ڕێگای ڕخاندن‌و ڕەخنەو شی‌کردنەوەو موناقەشەکردنیانەوە ئەو کێشانەی لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا هەیە بخەینە پێش‌چاو تا بەو پێیە بتوانین بناغەی تیۆریی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی دابمەزرێنین .

بۆ ئەوەی ئەو وتارانەم لە پەرش‌و بڵاوی‌و فەوتان ڕزگاربکەم‌و بۆ ئەوەی فەرهەنگ‌نووسە بەڕێزەکانمان بتوانن کەڵکی تەواویان لێ‌وەرگرن ، بەپێویستم زانی کۆیان‌بکەمەوەو بیانکەمە کتێبێك . ئەم بەرهەمە ــ « لە بوای فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا » ــ بەشێکن[4] لەو وتارانەی لەبارەی کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردییەوە لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا بڵاوم‌کردوونەتەوە .

بە هیچ چەشنێك دەستکاریی ناوەرۆکی وتارەکانم نەکردووە ،

---

(٤) وێڕای ئەو وتارانە ، هەندێ وتاری دیم بە کوردی هەیە ، کە خستوومنەتە ناو کتێبی ترەوەو بە پێویستم نەزانیوە دووپاتیان بکەمەوە . هەروەها بە زمانی ڕووسیش دوو وتارم بڵاوکردۆتەوەو لێرەدا چاپکردنیان ئاسان نییە .

تەنیا ئەگەر شتێك لە چاپدا پەڕیبێ خستوومەتەوە شوێنی خۆی یاخود شتێك قبوول نەکرابێ لامبردبێ • لە ڕووی شێوەو شێوازی نووسینەوە تەنیا لە چەند شوێنێکی کەمدا ناچاربووم جێگەی هەندێ وشە بگۆڕم • بەڵام ئەوەی پێوەندی بە ڕێنووسەوە هەیە بۆ مەبەستی باشخوێندنەوە دەستکاریی زۆرم کردووەو ئەمەش هیچ لە جەوهەری مەسەلە سەرەکییەکە ناگۆڕێ •

لەدایكبوونی هەر فەرهەنگێکی گەورەی کوردیی نوێ کارێکی گرنگی بۆ سەر فیلۆلۆژیی کوردی هەیە بەگشتی • چونکە لە هەر کارێکی وەهادا دەبێ هەموو لایەنە چاکەکانی کارەکانی پێشتر ڕەنگیدابێتەوەو هەموو ناتەواوییەکانیش دوورخرابنەوە • هەروەها پێویستە لەسەر بناغەی کەرەستەی نوێ هەندێ کێشە ساغکرابێتەوە ... مایەی بەختەوەریم دەبێ و هیواو ئاواتێکی گەورەم دێتەدی ، ئەگەر بتوانم بەم کارە خزمەتێکی بچووك پێشکەش بە فەرهەنگنووسەکانمان بکەم و لەبارەی کاری فەرهەنگنووسیی کوردییەوە چەند وشەیەکی بەکەڵك بنووسم •

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

# فەرهەنگی خاڵ

فەرهەنگ‌نووسی لـە کوردەواریدا لـە مێژە دەستی پێ کراوە ، کۆنترین فەرهەنگ کە نووسرابێ فەرهەنگی « نەوبەهار »ە ، کە لـە لایەن ئەحمەدی خانی‌یەوە نووسراوە لە ساڵی ١٠٩٤ك / ١٦٨٢زدا . دوابەدوای ئەم فەرهەنگە گەلێك فەرهەنگی هەمەچەشنە : ( عەرەبی ـ کوردی ، کوردی ـ عەرەبی ، ئیتالی ـ کوردی ، کوردی ـ ڕووسی ، ڕووسی ـ کوردی ، کوردی ـ فەرەنسی ، کوردی ـ ئەڵـەمانی ، کوردی ـ ئینگلیزی ... هتد )[١] نووسراوە چ لە لایەن کوردەوەو چ لە لایەن بێگانەوە . بەم جۆرە ئەتوانین بڵێین کە فەرهەنگ‌نووسیی کوردی هەمەچەشنە بناغەیەکی پتەوو ڕەگێـکی درێژی هەیە . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ، بەداخەوە تاکو ئێستا گەلێك فەرهەنگی پێویستمان نییەو ناتەواوی زۆرە لە کاری فەرهەنگ‌نووسیی کوردیدا .

هەروەها تاوەکو ساڵی ١٩٦٠ فەرهەنگێکی کوردی ـ کوردیمان نەبوو . هەستو چالاکیی مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ توانییان ئـەم کەلەبەرە پڕبکەنەوە . ئەوە بوو لە ساڵی ١٩٦٠ـ١٩٦٤دا بەرگی یەکەم‌و دووەمی « فەرهەنگی خاڵ »[٢] دەرچوو ، کە تا کۆتایی پیتی ( ف )

---

(١) لێکۆڵینەوە لـەو فەرهەنگانە ، کـە بەشێکن لـە نووسراوی « مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی » بە چەند وتارێك پێشکەشی ئەکەین .

(٢) شـێخ محەممەدی خاڵ ، « فەرهەنگی خاڵ » ، سلێمانی ، بەرگی یەکەم ، ١٩٦٠ ، بەرگی دووەم ، ١٩٦٤ .

دەگرێتەوە • بۆ ئەو بەشەی ماوە بەپێی زانینی من هێشتا دەرنەچووەو هۆی چییە نازانم • هیوادارم کە دەرچووبێ‌و من هەڵەبم ، یاخود ئەگەر دەرنەچووبێ ، مامۆستا خاڵ دەستی لێ‌هەڵنەگرتبێ‌و ئەو کارە بەنرخە پێویستە گەلی کوردمان بێ‌بەش نەکا •

« فەرهەنگی خاڵ » یەکێکە لە هەرە چاکترین فەرهەنگە چاکەکانی کوردی • بەرهەمێکی باشی پێگەیشتووی نوێیە ، کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ زوربەی خوێندەوارانی کوردستان ، ئەویش هۆی ئەو ڕێگا ڕاستەیە کە مامۆستا خاڵ گرتوویەتی لە نووسینی فەرهەنگەکەیدا ، بەوەی کە ناوەرۆکی فەرهەنگەکەی بریتییە لە وشەکانی گەلێك لـــە ناوچەکانی کوردستان ، وەك مامۆستا خاڵ خۆی ئەڵێ : « لە ســـاڵی ( ١٩٣٥ )ەوە بە هەموو هێزو تەواناى خۆمەوە خەریکی کۆکردنەوەی وتەی کوردیم بە هەموو ئاهەنگ‌و شـــێوەکانیەوە بە وتـــەی بابانو سۆرانو ، زازاو ، بۆتانو ، بادینـــانو ، لوڕو ، فەیلیو ، لـــەکو ، موکریانو ، ئەردەڵانەوە وە لەم ڕێیەدا زۆر ڕەنجم داوەو کۆششم کردووە تا وتەی ڕاست‌و دروستم کۆکردۆتەوە ••• »[٣] • ئەم جۆرە ڕێگایە بۆ ئەوەی فەرهەنگ بەکەڵك بێت نەوەك تەنها بۆ خوێندەوارانی ناوچەیەك لە کوردستان بەڵکو بەکەڵك بێـــت بۆ زوربەی کـــوردان ڕێگایەکی ڕاست‌و پێویست‌و نوێ‌و بەسوودە بۆ ئەوەی کە لە فەرهەنگ کۆمەڵێکی فراوانو زۆر لە کوردان کەڵك وەربگرنو هەروەها ڕێبازە بۆ یەکخستنی شێوەکانی زمانی کوردی‌و سەرچاوەیە بۆ ســـازبوونی زمانی ئەدەبی بۆ گەلی کوردمان •

وەك لە سەرەوە وتمان « فەرهەنگی خاڵ » یەکـــەم فەرهەنگی کوردی ــ کوردییە ، لەبەر ئەوە گەلێك کۆسپ لە ڕێگای دانانی ئەم

---

(٣) شێخ محەمەدی خاڵ ، « فەرهەنگی خاڵ » ، بەرگی یەکەم ، ل٥١ •

فەرهەنگەدا هەبووە . ئەوەتە مامۆستا خاڵ خۆی لەم بارەوە ئەڵێ :
« ئەوی لەم فەرهەنگە ورد ئەبێتەوە ئەبێ بزانێ کە تا ئێستا لەم ڕووەوە سەرمەشقێکمان بۆ دانەنراوە تا چاوی لێبکەین و فەرهەنگێکی تێکڕایمان بە زمانی کوردی بۆ نەنووسراوە تا لاسایی بکەینەوە .. »[٤].
بێ گومان نەبوونی سەرچاوەو نووسراوێکی پێشوو لەم چەشنە بووە بە هۆی ئەوەی « فەرهەنگی خاڵ » دوور نەبێت لە چەند ناتەواوییەك .
بە کورتی لەو ناتەواوییانە ئەدوێین :

پێش ئەوەی بێمە سەر باسکردنی ناتەواوییەکانی ناوەرۆکی ئەم فەرهەنگە ، ئەمەوێت بە چەند دێڕێك لە پێشەکییەکەی بدوێم .
هەرچەندە گرنگیی فەرهەنگەکە ناوەرۆکەکەیەتی ، بەڵام لەبەر ئەوەی زوربەی فەرهەنگنووسەکانمان لە پێشەکیی فەرهەنگەکانیاندا گەلێك شت ئەنووسن کە پەیوەندی نیە لەگەڵ مەبەستی فەرهەنگەکانیاندا ، وا ئەزانم ئەگەر بە کورتی لەم بەشە بدوێم لە کەڵك زیاتر زیان نادەم .

مامۆستا خاڵ لە لاپەڕە ( ٧ـ١٠ )دا زۆر بە وردی باسی پێویستیی و نرخی فەرهەنگ ئەکات بۆ مانەوەو پێشخستنی زمان .

لە لاپەڕە ( ١٠ـ١٥ )دا بە کورتی باسی ئەو فەرهەنگە کوردیانە ئەکات ، کە لە پێش فەرهەنگەکەی ئەوەوە نووسراون . لێرەدا تەنها باسی حەوت فەرهەنگی کردووە : ( ئەحمەدی خانی ، ئەحمەدی یوسف ضیا پاشای خالیدی ، فەردیناند یوستی ، مێجەر سۆن ، ڕابەر ، مەردۆخ )[٥] . بەڵام گەلێك فەرهەنگیتر هەن ، وەك : ( گەرزۆنی ، لێرخ ، فۆسوم ، یەگیزارۆڤ ، جاردین ... هتد)[٦] و

---

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ١٦ .

(٥) ، (٦) لێکۆڵینەوە لەو فەرهەنگانە بە چەند وتارێکی تایبەتی پێشکەش ئەکەین .

باسی نەکردوون . دیارە ئـەم فەرهەنگانە بە دەست مامۆستا خاڵ نەگەیشتوون ، بەڵام فەرهەنگی « کۆلکەزێڕینە »ی مامۆستا گیوی موکریانی ، کە ساڵی ١٩٥٥ دەرچووە ، لەو باوەڕەدام مامۆستا خاڵ لە یەکەم ڕۆژەوە چاوی پێ‌کەوتووە . لەبەر ئەوە ، کە هاتۆتە سەر باسی فەرهەنگە کوردییەکان ئەبوایە باسێکی « کۆلکەزێڕینە »شی هـەر بکردایە . جگە لەوە لەگەڵ باوەڕی مامۆستا خاڵدا نیم کـە ئەڵێ : « نەوبەهارو ئەحمەدیو ڕابەر لە عەرەبییەوەن بۆ کوردی ، واتـە فەرهەنگی عەرەبین نەك کوردی »[٧] . ڕاستە ئەم فەرهەنگانە لـە عەرەبییەوەن بۆ کوردی ، بەڵام عەرەبیی ڕووت نین ، بەڵکو ساماتێکی ئێجگار گەورەن لە مێژووی فەرهەنگ‌نووسیی کوردی‌داو هەروەها بۆ نووسینی فەرهەنگی کـوردی ــ کـوردی لە بەشە کوردییەکانیان ئەتوانرێ کەڵکی باش وەربگیرێ ... لەبەر ئەوەی تاکو ئێستا لـە فەرهەنگی کوردی کەم دواون ، ئەم باسەی مامۆستا خـاڵ کەڵك‌و سوود دەگەیەنێ .

نووسەر لە لاپەڕە ( ١٧ـ٢٦ )دا چەند باسێکی کردووە ، وەك : پەیدابوونی وتەو زمان ؛ جیابوونەوەی زمان‌و وتەی زمان ؛ لق‌وپۆپی زمان ؛ کورد ؛ پێکەیشتنی زمانی کوردی ؛ جیابوونەوەی شـێوەی کوردی ؛ سنووری کوردستان ... ئەم باسانە زۆر پەیوەندییان لەگەڵ مەبەستی فەرهەنگ‌داناندا نییەو ئەتوانرێ بکرێن بە سێ بەشەوە ؛ کە بەستراون بە سێ لقی زانستی جیاوازەوە : ١ــ مێژوو ؛ ٢ــ جوگرافیا ؛ ٣ــ زمان بەگشتی . لەو باوەڕەدام ئەم باسانە کـە نزیکەی ( ١٠ ) لاپەڕەیان داگیرکردووە لەناو فەرهەنگەکـەدا نەبوونایە باشتر بوو .

---

(٧) سەرچاوەی ناوبراو ، « فەرهەنگی خاڵ » ؛ بەرگی یەکـەم ، ل ١٤ ــ ١٥ .

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە ، کە ئەم باسانە ڕاست نین ، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ، بڵێم ئەتوانرا لە جێگایەکی‌تردا بلاوبکرانایەوە ، تەوەك لێرەدا باری فەرهەنگەکە گران بکەن . لە سەرێنکی‌کەوە لەو باوەڕەدام ، هۆی بلاوکردنەوەی گەلێك باس لەناو فەرهەنگدا کـە پەیوەندیان کەمە لەگەڵ کاری فەرهەنگدا ئەم دوو هۆیەن : یەکەم ــ لەبەر ئەوەی لـە کـوردەواریدا مەودای بلاوکردنەوە هـەردەم کـەم بووە ، بۆیە فەرهەنگ‌نووسەکانمان لە ڕێگای پێشەکی‌یەکەیانەوە هەولیانداوە لە زۆر شـت بدوێن . دووەم فەرهەنگ‌نووسەکانمان ویستوویانە زانین‌و تواناو ڕازی خۆیان بۆ گەلیان دەرخەن .

لـە لاپەڕە ( ٣١ــ٣٨ )دا بە کـورتی‌و ڕاست‌و جـوان چەند زانیارییەکی پێویستی لەبارەی ڕێزمانی کوردییەوە داوە ، کە بەتەواوی لەگـەڵ مەبەستی فەرهەنگەکەدا ئەگونجێ‌و بۆ گۆڕینی وشە بەپێی پێویست بەکارهێنەری فەرهەنگەکە ئەتوانێ سوودی لێ‌ببینێ . لـەم بەشەدا چەند کەم‌وکورتییەکی بچووك هەیە ، وەك ئەوەی لە لاپەڕە ( ٢١ ــ ٣١ )دا باسی « پیتی کوردی‌و نووسینی کوردی »ی ئەکات‌و ئەمەی لە بەشی ڕێزمان جیاکردۆتەوە . بەڵام ئەبوایە ئەمەش هەر لەناو بەشی ڕێزمانەکەدا بووایە ، چونکە پێوەندیی ڕاستەوخۆی پێوە هەیە . . هەروەها چەند زاراوەیەکی داوە ، کە بە باوەڕی من زۆر لە جێگای خۆیاندا نین ، وەك بۆ جیاکردنەوەی پیتی ( ر ) ــ ( ڕ ) ، ( ل ) ــ ( ڵ ) هاتووە ( ر )ی ناوناوە بچووك‌و ( ڕ )ی ناوناوە گەورە . ( ل )ی ناوناوە سووك‌و ( ڵ )ی ناوناوە قەڵەو . هەرچەندە بچووك‌و گەورە تا ڕادەیەك ڕاستن ، بەڵام بە تەواوی ناگونجێن . خۆ سووك‌و قەڵەو هەر بە هیچ جۆرێك بە ڕاستی نازانم ، چونکە ئەم دوو وشەیە دوورن لە یەك ، بەڵام زۆر باش دەبوو ئەگەر مامۆسـتا لاوازو قەڵەو ، یا لەڕو قەڵـەوی بەکاربهێنایە . هەروەها ئەتوانرێ لەرم‌و ڕەق بەکاربهێنرێ .

لـه لاپەڕە ( ٣٨ ـ ٣٩ )دا ئەو نیشـانانە ئەدات ، کـە لەناو فەرهەنگەکەدا بەکاری هێناوە . ئەو فەرهەنگانەی لە کوردستاندا تـا سالی ١٩٦٠ دەرچوون ئەم پێویستییەی تیایاندا باس نەکراوە ، تەنهـا مامۆستا خال بۆ یەکەم جار هەستی بەوە کردووەو بەمە کاری بەکارهێنانی فەرهەنگەکەی ئاسان کردووە .

بەگشتی ئەم فەرهەنگە لەسەر شێوەیەکی جوان و ڕاست دانراوە . گەلێك لەو گرانیی و زەحمەتیی و ناتەواوییانەی لەناو فەرهەنگەکانی پێش ئەودا هەبوون ، مامۆستا خال ئاسانی کردوون و پڕی کردوونەتەوە . دیـارە نووسەر خۆی زۆر لەگـەڵ نووسـینی فەرهەنگەکەیدا خەریك کردووە . هەروەها بۆ کۆکردنەوەی وشـەی کوردی زۆر گەڕاوەو خوێندنەوەی فەرهەنگەکەی ئەو ڕاستییە دەردەخات و زوربەی وشەکانی زمانی کوردی بەرچاو ئەکەون .

بۆ لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی مانای وشە ، نووسەر چـەند ڕێگایەکی ڕاستی زانستی گرتووە . بۆ ئەو وشانەی بتوانرێ بە یەك وشە مانای نیشان بدرێ ، نیشانی داوە . وەك ( ئامشۆ ) بەرامبـەری نووسـیویتی ( هاتوچۆ ) ؛ بەرامبەر بە ( ئالۆشـدار ) نووسیویتی ( ئالۆشاوی ) ... هەروەها کـە هاتۆتە سەر وشەی ( هاتوچـۆ )و ( ئالۆشاوی ) بەجیا ڕاڤەی کردوون ، نەوەك یەکێك مانای ئەم وشانەش تێنەگات . وەك وتمان ئەمە ڕێگایەکی ڕاستە ، بەلام ناتوانرێ لە هەموو شوێنێکدا بەکاربهێنرێ . چونکە لە هەندێ شوێندا ڕوونکردنەوەو لێکدانەوەی وشەیەك بە یەك وشە نادرێ ، وەك ئەبینین مامۆستا خال بۆ مانای ( ئازادخوا ) وشەی ( ئازادخواه )ی داوە . لەو باوەڕەدام ، ئەگەر یەکێك لە ( ئازادخوا ) تێنەگات ، ئەوە لە ( ئازادخواه )یش تێناگات ، بەلام مامۆسـتا مانای ئـەم دوو وشـەیەی بە ئالۆزی نەهێشتۆتەوە ، ئەویش بەوەی کە تۆرە هاتۆتە سەر وشەی (ئازادخواه)

ڕاڤەی کردووەو مانای کردۆتەوە • بەم جۆرە مانای ئەو دوو وشەیە ئاشکرابووە • لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ شوێنی کەمدا لەم بارەیەوە کەمو کــوڕی هەیە ، وەك ئەبینین بۆ مانای ( ئاقدیین ) بەرامبــەری ( تۆلەسەندن )ی داوەو کەچی وشــەی ( تۆلەسەندن ) بەجیا لــــە فەرهەنگەکەدا نییە • بۆ ( ئاگرپارێز ) بەرامبەری ( ئاگرپەرست )ی داوە ، بەڵام بەجیا وشەی ( ئاگرپەرست ) لە فەرهەنگەکەدا نییە ••• هتد • جگە لەوە هەندێ لەو وشانەی ماناکانیان بەیەك وشە کردۆتەوە ، زۆر باش ناگــونجێن • وەك بۆ دانی مانای ( باڵگرتن ) بەرامبــەری ( فڕین )ی داوە • ڕاستە ئەم دوو وشەیە لەیەکەوە نزیکن و بۆ مانای یەکەمی ئەگونجێ ، بەڵام بۆ مانای دووەمی ئەم وشەیە جیاوازی هەیە • جیاوازییەکەش ئەوەیە کە ( فڕین ) مانایەکی گشتی هەیە • مانای تەواوی ( باڵگرتن ) بۆ مانای دووەمی نەك ( فڕین )ە بەگشتی ، بەڵکو ( فێربوونی فڕین )ە وەك چوون تازە چۆلەکە یان کۆتر ••• ( فێری فڕین ئەبن )و ئەڵێن : ( باڵیانگرت ) ••• بۆ مانای ( بڕیار ) بەرامبەری ( پەیمان ) نووسراوە • ئەم دوو وشەیە لە یەکەوە نزیکن ، بەڵام مانایان تا ڕادەیەك جیاوازە • بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە ، نەوەك کـــە ئەزانین بە عەرەبی ( بڕیار ) ــ ( قرار )ەو ( پەیمان ) ــ ( وعد )ە ، بەڵکو ئەگەر لە دوو ڕستەی کوردیدا ئەم دوو وشەیە بەکاربێنین ، ئەبینین کە مانایان یەك نییە :

چاوەڕوانی پەیمانم •••

بڕیاری ژمارە یەك •••

••• هتـــد •

زۆر وشە هەن کە خاوەنی یەك مانان ، وەك ( ئاڕوا ، ئارۆ ، ئەمڕۆ ، ئیمڕۆ ، ئیرۆ ) • لێرەدا مامۆستا خاڵ زۆر چاكو کورت ئەم چەند وشە خــاوەن یەکمانایەی داوەو تەنهــا وشەی ( ئیمــڕۆ )ی لەناویاندا

(٣) شدا وتارێکی هەیە [٤٦] ، (٣٠) نموونەی تێدایە ــ(٢٦)یـان (دە)ن و تەنیا (٤)یان (ئە)ن . لە ژمـارە (٤)یشدا وتـارێکی بڵاوکردۆتـەوە [٤٧] (٥) نموونەی تێدایە و هەر (٥)یان (دە)ن ... ڕەفیق حیلمی لـەو شیعرەیدا ، کە لە ژمارە (٢)ی ڕۆژنامەی ((بـانگی کوردسـتان))دا چـاپی کـردووە [٤٨] تێکرا (دە)ی بـەکارهێناوە ... عـەلی کـەمال باپـیر لـە وتـاری ((تەربیـەتی ئـەولاد))دا [٤٩] (١٥) جـاری (دە)ی بـەکارهێناوە و (٩) جـاریش (ئــە) ... لەمانە و لە گەلێك نووسینی دی ((بـانگی کوردسـتان)) و چاپەمـەنی تـری ئـەو کاتـەدا بـە زۆری (دە) دەبینـرێ، بــەڵام بەشـێکی کەمیشـیان پــتر (ئە)یان دەنووســی ، وەك زەکـی صـائب و م . نـووری ... بەوێنـە زەکـی صائب لە وتاری ((مەســەلەی مەکتـەب کردنـەوە))دا [٥٠] ــ (١٥) جـار ــ (ئە)ی بەکارهێناوە ، کەچی تەنیا جارێك (دە)... م . نووریش لە وتاری ((ماکینەی چـاپ))دا [٥١] ــ (١٧) کـەڕەت (ئـە)ی نووسـیوە و تـەنیا دوو جار (دە) ...

---

(٤٦) مستەفا پاشا ، حەسەب حالی دووەم ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٢ ، ٢١ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ـ٢ .

(٤٧) مستەفا پاشا ، ئەحوالی ضابطانی کورد ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٤ ، ٢٨ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ـ٢ .

(٤٨) ڕەفیق حیلمی ، بۆ کوردان ، ((بانگی کوردستان)) ، سالی ١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٢ .

(٤٩) عەلی کەمال باپیر ، تەربیەی ئـەولاد ، ((بـانگی کوردسـتان)) ، سـالی ١ ، ژ ٥ ، ٤ ئەیلوول ١٩٢٢ ، ل ٢ـ٣ .

(٥٠) زەکی صائب ، مەسەلەی مەکتەب کردنەوە ، ((بانگی کوردســتان)) ، ســالی١ ، ژ ٢ ، ١٤ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ١ـ٣ .

(٥١) م . نـووری ، ماکینـەی چاپ ، ((بـانگی کوردسـتان)) ، سـالی ١ ، ژ ٢ ، ٢١ ی ئابی ١٩٢٢ ، ل ٣ـ٤ .

ژمـاره (١) و (٢)ی ڕۆژنامـەی ((تێگەیشـتنی ڕاسـتی)) لـە مەسـەلەی بەکارهێنانی (دە) و (ئە)دا چاوخەڵەتێنن ، چونکە وا نیشان دەدەن ، کـە نووسـەرانی ئـەو ڕۆژنامەیـە لایـەنگیری بـەکارهێنانی (ئـە) بوویـن ، بـەڵام تەماشـاکردنی ژمارەکـانی دی ئـەو تەمـە دەیوەێنێتـەوە و ئـەوەمان پێدەسەلمێنێ ، کە د. کەمال مەزهەر ورد لـەو کێشـەیەی کۆڵیوەتـەوە و ڕاست بـۆ ئـەوە چـووە کـە ((تێگەیشتنی ڕاسـتی)) زۆر جـار (دە)ی وەك خۆی هێشتۆتەوە و جارویاریش کردوویە بە (ئە)[٥٢] .

چاوخەڵەتێنی ژمـاره (١) و (٢) لەوەدایـە ، کـە شێوەی (ئـە)یـان لـە (دە) کەمێك پتر تێدا بـەکارهێنراوە . بـۆ نموونـە لـە ژمـاره(١)دا پـازدە (ئـە) و چـواردە (دە) هەیـە ؛ ژمـاره (٢) ــ شـەش (ئـە) و پێنـج (دە)ی تێدایە . کـەچی لـە ژمـاره (٣)وە ئـەم دیاردەیـە نـەك هـەر بەپێچەوانـەوە دەبینـین ، بـەڵکو تـا پـتر بـەرەو دوا ژمارەکانیشـی بڕۆیـن ، نیسـبەتی بەکارهێنانی (دە) زیـاد دەکا و (ئە) بەرەو کەم بوون دەچێ . بەوێنـە لـە ژمارە (٣)دا یازدە (ئە) و هەژدە (دە) هەیە ؛ ژمـاره (٤) ــ چـوار (ئـە) و پـازدە (دە)ی تێدایـە ؛ لـە ژمـاره (١٠)دا ــ چـوار (ئـە) و نـۆزدە (دە) دەبینـرێ ؛ شـەش (ئـە) و چـل و حـەوت (دە) لـە ژمـاره (٦٥)دا بـەرچاو دەکەوێ[٥٣] .

---

(٥٢) د . کەمال مەزهەر ، ((تێگەیشـتنی ڕاسـتی)) و شـوێنی لـە ڕۆژنامەنووسـی کوردیدا ، بەغدا ، ١٩٧٨ ، ل ١٥٢_١٥٣ .

(٥٣) ئەو (ئە)یانەش کە لە دوا ژمارەکاندا دەبینرێن ، بـە زۆری لـە وشەی (ئەڵێ) دان .

من وای بۆ دەچم ، مێجەر سۆن (ئە)ی پێخۆش بوویێ ، بەڵام زوو لەوە تێگەیشتبێ ، کە بۆ زمانی ئەدەبی و نووسین شێوەی (دە) لەبارترە [54] . ئەگەرچی لە ئاخاوتنی ئێستای سلێمانیدا تەنیا (ئە) بەکاردەهێنرێ و (دە) بەتەواوی لەبیرچووەتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی گۆڕانێکی شێواوە و سەرەڕای ئەوەش ، چونکە نەك هەر لە دیالێکتی ژووروودا ، بەڵکو لە زوربەی بەشە دیالێکتەکانی دی خوارووشدا هەر شێوەی (دە) ماوەتەوە ، بۆیە ڕاست وایە لە زمانی ئەدەبی و نووسیندا واز لەو جۆرە تایبەتییە ناوچەییانە بهێنرێ . شایانی باسە ، کە مامۆستا تۆفیق وەهبیش لە هەمان ڕادایە و بەو بۆنەیەوە دەڵێ : پێویستە ((لەباتی (ئە)ی پیتە قاڵبی (دە) بەکاربێنین)) [55] .

٢ـ د > ی ـ y

ئەمە لە حاڵەتێکدا ڕوودەدات ، کە بکەوێتە نێوان دوو بزوێنەوە :

بادان > بایان

دادان > دایان

لە سەرمادا > لە سەرمایا

لە دنیادا > لە دنیایا

بادەم > بایەم

---

(٥٤) مێجەر سۆن لەو وتارەیدا ، کە لە ڕۆژنامەی ((پێشکەوتن))دا بڵاوی کردووەتەوە ، بە دەگمەن شێوەی (ئە)ی بەکارهێناوە . جا ئەمەش بەڵگەیێکی پتەوە ، کە ناوبراو شێوەی (دە)ی پەسەند کردبێ .

(٥٥) تۆفیق وەهبی، سەرچاوەی ناوبراو ، ئەسڵی پیتە قاڵبی شێوەی سلێمانی ، ل ٣١ .

ماده > مایه

.... هتد .

.... (٥٦)

٣ــ د > ت

بەتایبەت کە دەکەوێتە کۆتایی وشەوە . وەك :

نەوەد > نەوەت

سەد > سەت

مەهاباد > مەهابات

کرد > کرت

....هتد .

٤ــ د > و

قەد > قەو

بەد > بەو

---

(٥٦) پێویستە پەنجە بۆ ئەوەش رابکێشین ، کە لە هەندێ وشەی وەك (داخۆ،داخوا...)دا (د) دەبێ بە (ئـ) یان (ی ـ Y ) :

داخۆ > ئاخۆ ـ یاخۆ

داخوا > ئاخوا

داخوا دەروونی شەق نەبووە ( پردی سەرشەقام ) ؟

پیر و فوتادە تەن نەبووە ( داری پیرەمسوور ) ؟

( نالی ، ل ١٨٤ ، د ٥ )

بەهارێکی کە داخۆ بێ ، نەیێ ، هەی بێن و شینێ کەین

فەلەك هەر شینە ، سەحرا شینە ، کێو و لێوی جۆ شینە

( مەحوی ، ل ٢٨٢ ، د ٢ )

ئایا بە جەمع و دائیرەیە دەوری ( کانی با ) ،

یاخۆ بووە بە تەفریقەیی شۆرش و نوشوور ؟

( نالی ، ل ١٦٨ ، د ١ )

٥ـ د > گ

دەمێ بە دوای دەنگی (ن)دا دێت . وەك :

مەند > مەنگ

دەربەند > دەربەنگ

ئەوەندە > ئەوەنگە

...هتد [٥٧]

ـ ٤ ـ

## Assimilation ـ وێکچـــواندن

وێکچواندن لە ئەنجامی کار لە یەکدی کردنی کشانەوە و هەڵمەتی دەنگە دراوسێکاندا ، کە قورسایی‌یان لەسەر یەکدی هەیە ، پەیدا دەبێ . وشەی (assimilatio)ی لاتینی خۆی دەتوانێ ببێتە نموونەی وێکچواندن . ئەم وشەیە لە : (assimulo) ــ ( وێکیان دەچوێنم ، یەکیان دەخەم )ەوە دروست کراوە . ئەم کردارە لە پێشگری ( ad < as) و کرداری (simulo) پێکهاتووە . ئەگەر لەگەڵ (assimilis) ــ (لێچوو)دا بەراوردی بکەین ، دەبینین لە دروست بوونیدا پێشگر(ـ ad ):

---

(٥٧) لەم بارەدا دوو دەنگی (ن) و (گ) تێکەڵ بەیەك دەبن و دەنگێکی پەنگ خواردووی قورسی ناقۆڵا دەردەبڕرێ .

هەر لەم دۆخەدا هەندێ ئاخێوەر بەشێك لەو وشانە بەرەو سووك بوون دەبەن ــ واتە (د)ەکەی تێ‌دەچوێنن و دەڵێن : دەربەن ، ئەوەنە ، گوڵبەن ...

دەبێ ئەوەش لەبیرنەکەین ، کە (د)ی هەندێ لەو جۆرە وشانە ، بەو چەشنەی هەن ، بە ئاسایی دەوترێن ، وەك : هێندە ، بەندە ، کەند ...

(ad - similis) هەیە . کۆنسۆنانتی ( d)ی پێشگر بە تەئسیری هەڵمەتی دەنگی ( s) ئاوازەدارێتی و کۆسپەکی لە دەست دەدا ...

وێکچواندن بریتییە لە کارتێکردنی دەنگەکانی دراوسێ لە کۆمەکی وتندا ، پتریش لە هەر شت کۆنسۆنانت لە ڕووی ئاوازەداری و کپی ؛ نەرمی و توندییەوە دەکەوێتە ژێر باری کارتێکردنەوە .

وێکچواندنی هەمەکی ( الكلی ) و هەندەکی ( الجزئی ) هەیە . وێکچواندنی هەمەکی بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە هەردوو دەنگەکە بە تەواوی وەك یەکیان لێ بێت . بۆ نموونە ( کردتان ) بە (کرتتان) تەلەفوز دەکرێ ــ واتە (د) بە کارتێکردنی (ت)ی دوایەوە ، دەبێ بە (ت) . لێرەدا لە سەرێکەوە دەنگی (د) لە ئاوازەدارییەوە دەبێ بە کپ و لە سەرێکی دییەوە وەك (ت) ی دواوەی لێ دێ . وێکچواندنی هەندەکی (ناتەواو) ، بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە لە یەك ڕووەوە گۆڕان بەسەر یەك دەنگدا بێ . بەوێنە لە وشەی ( گەستی )دا (ز) تەنیا لە باری کپ بوونەوە کەوتووتە ژێر کارتێکردنی (ت)ەوە و بووە بە (س) ، نەك بە (ت) .

کاری وێکچواندن لە ڕووی ئاراستەکردنیشەوە دوو جۆرە :

ڕاستەوخۆ و پێچەوانە . لە حاڵەتی وێکچواندنی ڕاستەوخۆدا قورسایی هەڵمەت لە کۆنسۆنانتی پێشەوە بۆ کشانەوەی ئەو کۆنسۆنانتەی بە دوایدا دێ ڕوودەدات ... لە حاڵەتی وێکچواندنی پێچەوانەشدا کشانەوەی کۆنسۆنانتی دواوە دەکەوێتە سەر هەڵمەتی کۆنسۆنانتی پێشەوەی . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا نیشانەی ( s )ی بەدوا دەنگی ئاوازەداردا وەك ( z) دەوترێ: Handz < Hands ؛ readz < reads ... و ئەمە وێکچواندنی ڕاستەوخۆیە . بۆ نموونەی پێچەوانەش ، ئەوەیە لە زمانی کوریدا ، کە دەنگی کپی (ش) لەبەردەم هەندێ دەنگی ئاوازە داردا وەك

(ژ) دەوتریٚ : هەشت > هەژدە ...[٥٨]

## ١ــ وێکچواندنی هەمەکی (الکلی) ــ Complete assimilation

ئەم حاڵەتە کە بە زۆری لە شێوەی سلێمانیدا دەبیسترێ و گەلیٚ دەنگ دەگرێتە خۆ ، کە لە نێوانیاندا فۆنێمی (د) ــ واتە شەوەی مەبەستی ئەم لێکۆڵینەوەیامانە ــ پتر ئەو گۆڕانکارییەی بەسەردا دیٚ :

أــ لە وشەیێکی ناسادەدا گەر مۆرفێمی یەکەم کۆتایی بە دەنگی ( ز ، م ، ڤ ، ن ، ڵ ، و ، ر ... ) هاتبێ و یەکەم دەنگی مۆرفێمی دووەمی (د) بیٚ ، ئەوە ئەو (د)ە ، وەك ئەو دەنگانەی مۆرفێمی یەکەمی لیٚ دیٚ :




(٥٨) سەرەتاییێکی زمانناسی (بەرگی یەکەم) ، سلێمانی ، ١٩٩٨ ، ل ٢٩٢ــ٢٩٣ ، (میدیا لە ڕووسییەوە وەریگێڕاوەتە سەر کوردی) .

(٥٩) (حەڤڤە) پاش هەندیٚ گۆڕان ئەم قاڵبەی ئێستای وەرگرتووە . ئەم وشەیە بە ئەس[illegible] لە (حەفت + دە) پێکهاتووە . دەنگی (ت)ی تێچووە ... ئەوجا ک[illegible]ی کپی (ف)ی ،کە کەوتووەتە پێش کۆنسۆنانتی ئاوازەداری (د)ەوە ، ئاوازەدارێتی وەرگرتووە ــ واتە بووە بە (ڤ) :

> حەودە > حەڤدە

بە[illegible] ئەمانەشدا لە شێوەی سلێمانیدا بەر یاسای گونجاندنی هەمەکی [illegible]رتووە و بووە بە (حەڤڤە) .

ب ـ دەنگی (د) نەك هەر كە دەكەوێتە دوای ئەو دەنگانەی ناومان بردن ، بەر یاسای گونجاندنی هەمەكی دەكەوێ ، بەڵكو كاتێ لە پاش یان لە پێش دەنگی (ت) شەوە دێت ، دیسان تووشی هەمان گۆڕان دەبێ :

یەكەم ـ كاتێ لە پاش دەنگی (ت)ەوە دێت .

واتە ـ ت د > دد . وەك :

ماتدان > माددان

خەتدار > خەددار

....[60]

دووەم ـ دەمێ دەكەوێتە پێش دەنگی (ت)ەوە :

واتە ـ دت > تت

كردتان > كرتتان

بردتان > برتتان

...[61]

---

(٦٠) شایانی باسە ، مامۆستا ( طالب حسین علی ) دەربارەی وێكچواندنی هەمەكی ، كە ئەو بە ( گونجانی تەواو ) ناوی بردووە ، زانیاریی باشی تۆمار كردووە ( بڕوانە : فۆنۆلۆجی كوردی و دیاردەی ئاسان بوونی فۆنێمەكان لە زاری سلێمانیدا ، نامەی ماجستێر ، هەولێر ، ١٩٨٩ ، ل ٤٩ ـــ ٥٠ ) . وێڕای باسی ئەو كێشەیە ، هەر لە هەمان بەشی دووەمی نامەكەیدا ، گەلێ بار و دیاردە و یاسای دی فۆنۆلۆژی یادداشت كردووە و ، ورد و زانایانە لە زۆربەیانی كۆڵیوەتەوە . ( ل ٤٠ ـ ٩٥ ) .

(٦١) ڕەنگە خراپ نەبێ ، گەر حاڵەتی یەكەم بە گۆڕانی بەرەو پێشەوە ناوبەرین و ، ئەوەی دووەم بە گۆڕانی بەەو دواوە .

### ٢ـ وێکچواندنی هەندەکی (الجزئی) ـPartial assimilation

لە وێکچواندنی هەندەکی‌دا (د) لە حاڵەتی ڕاستەوخۆدا بەدی ناکرێ و ، تەنیا وێکچواندنی پێچەوانەی هەیە . وەك :

هەشت + دە > هەژدە [٦٢]

پشت + دەر > پژدەر [٦٣]

... هتد .

## ـ ٥ ـ

## ڕێککەوتن

دەنگی (د) بە دوای دەنگی (ر)دا زۆر دێت : برد ، کرد ، مرد ، کورد ، سارد ، دەرد ، هەرد ، وەرد ، بەرد ، گرد ، پرد ، گەردن ، ورد ،

---

(٦٢) وشەی (هەژدە) لە (هەشت) و (دە) پێکهاتووە . لە سەرێکەوە دەنگی (ش) تێچووە ، واتە لەمەدا بەر یاسای تێچوون کەوتووە . لە سەرێکی دیکەوە (د) کە کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە لەگەڵ دەنگی (ژ)دا ، کە ئەمیش هەر کۆنسۆنانتی ئاوازەدارە پتر دەگونجێ ، وەك لەگەڵ (ش)دا ، کە کۆنسۆنانتی کپە . لەم ڕووەوە یاسای گونجاندن کاری کردووە .

(٦٣) وشەی (پژدەر) لە ((پشت + دەر)) پێکهاتووە . لە وشەی (پشت)دا دەنگی (ش) کپ تەلەفوز دەکرێ . کاتێ وشەی (دەر)ی دەخرێتە سەر و (ت) تێدە ... ، (ش)ی کپ دەبێتە ئاوازەدار و بە (ژ) دەوترێت . ئەویش هۆی دە ... یاسای گونجاندنە ـ واتە کاتێك (ش)ی کۆنسۆنانتی کپ دەکەوێتە ... ی کۆنسۆنانتی ئاوازەدارەوە ، دەبێتە دەنگێکی ئاوازەدار .

بێگەرد ، شەوگەرد ، پەردە [٦٤]... و تێش ناچن [٦٥] ... واتە ناوتریّ ؛
بر ، کر ، سار ، دەر ، هەر ، وەر ، بەر ، گر ، پر ، گەرن ، ور ، بێگەر ،
شەوگەر ، پەرە ...

ئەمە وا نیشان دەدا ، کە دوو دەنگی (ر) و (د) حەز بە خزمایەتیی
یەکدی دەکەن و یەکتر دەپارێزن [٦٦] .

... [٦٧]

---

(٦٤) شان و مل و گەردنی پووتی بێگەرد
سنگی نەرم و ، مەمکی قوتی توند وەك بەرد
( گۆران ، ل ٤٧ )
لەبەر ئەوەی بەشەرێکم زەبوونی دڵ ، هەڵبەت
حەقم بو پەردەیی شەرم و حەیام دڕی ، لام برد !
( گۆران ، ل ٧٣ )

(٦٥) بە دەگمەن نەبیّ لە چەند وشەیێکی یەکجار کەمدا حاڵەتی تێچوونیشی هەیە .
وەك : زەرد > زەر ، ئارد > ئار

(٦٦) مامۆستا مەسعوود محەمەد لە وتاری ( فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ) ، (( گۆڤاری
کۆڕی زانیاری کورد)) ، بەرگی سێیەم ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ١٩٧٥ ، ل
٥٩٢ـ٥٩٤ و ٦٠٤ـ٦٠٥، لە باسی ( گونجانی تەولو )ی دەنگەکاندا لەم
دیاردەیە دواوە .

(٦٧) لەبەر ئەوەی سەرجەمی سەرچاوەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لە پەراوێزدا
ناویراون ، بە پێویستی نازانم لە لیستێکدا کۆیان بکەمەوە و سەرلەنوێ
بیانخەمە بەر چاوی خوێنەر ... هەروەها لەو ڕایەدام ، کورتە باسێکی وەها ،
کورتە و ئەنجامی ناویّ .

# بنج و بناوانی هەندێ وشە

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

- بەشی یەکەم -

بەغدا - ٢٠٠٠

## پێشەکی

ئێتیمۆلۆژی ئەو بەشەیە لە زانستی وشە ، کە لە پەیدابوون و وەرگرتن و گەشەکردنی وشە و ئەو دەورانەی پێیدا تێپەڕیوە دەدوێ.

وشەکانی زمانی کوردی قاڵ بۆوەی ساڵانی دوور و درێژی مێژووی گەلی کوردە و سۆرە و تۆرەی چەندین پلە و قۆناخی هەڵس و کەوتی باری ژیانی هات و نەهاتێتی. لەو ماوە درێژ و بەرفراوانەدا کە بە سروشت لە کەو دراون و گێژە کراون و گورگە و بنژیل و زێوانیان لێگیراوە ، لە زۆر ڕووی گرنگەوە پتەو بووە و بە خۆدا هاتۆتەوە و دەوڵەمەند بووە .

پەیدابوون و گەشەکردنی وشەکانی زمانی کوردی ، وەکو هەموو زمانەکانی سەر ڕووی ئەم زەمینە لە دوو ڕێگەوە سەری‌هەڵداوە. یەك ـ ڕێگەی ڕاستەوخۆ، کە ئەویش هەڵێنجانی وشەی کوردیی ڕەسەنە لە نێو زمانی کوردیدا ؛ دوو ـ ڕێگەی لاوەکی ، کە ئەویش وەرگرتنی وشەیە لە زمانی بێگانەوە.

بەم جۆرە لە لێکۆڵینەوەی ئێتیمۆلۆژیی زمانی کوردیدا ، پێویستە بەتایبەتی بنجی زمانی کوردی ساغ بکرێتەوە ؛ وشەی ڕەسەنی کوردی و وشەی ئێرانی و هیند و ئەوروپایی دەست نیشان بکرێن ؛ وشەی بێگانە و ڕەگی بێگانە لە زمانی کوردیدا دیاری بکرێن ؛ چالاکی و سستی وشەکانی زمانی کوردی بخرێنە پێش چاو...هتد.

بەو پێیە ، هەوڵ دەدەین ماک و بنەما ؛ ڕەگ و ریشە؛ ڕەگەز و بنچینە ؛ بنج و بناوان ...ی هەندێ وشەی زمانی کوردی لەو شێوەیەی ئەمڕۆیدا کە هەیە ، لێك بدەینەوە و بەپێی توانست لەگەڵ زمانانی خزم و بێگانەدا بەراوردیان بکەین.

## ئاگر:

له شــێوه جۆربــهجۆرەکانی زمــانی کوردیــدا ئــهم فۆرمانەی خوارەوەش بەکاردێنرێن :

ئاور ، ئینگـر ، ئـاهر ، ئایـهر ، ئـار ، ئـایر ، ئاتــهر ، ئادر، ئاتەش...

ئاوێستا : ئاتەر

پەهلەوی : ئاتەرش

## تێبینی :

* (تــه)ی (ئاتــهر)ی ئاوێســتا بــووه بــه (گ) و وشــهی (ئاگر)ی لێ کەوتووەتەوە .

هەرچی وشەکانی دیە (تە)ی ئاوێستا :

١. بووه به (و ، ه ، ی ، د ، ت ، یه)




٢. تێچووه :

ئاتەر . ئا (تە)ر > ئار

٣ . ماوەتەوە

ئاتەر - ئاتەر

* (ئا)ی ئاوێستا بووە بە (ئیٚ) :

ئیٚگر

*(ر)ی پەهلەوی تیٚچووە و (ئاتەرش) بووە بە (ئاتەش)

**ئاباد :**

- ئابات ، ئاوا ، ئاوەدان ...

١ . لە زمانە ئیٚرانییەکاندا وەك مۆرفیٚمیٚکی بەند بە دوا ناویٚکدا دیٚ و یـاریدەی ڕۆنـانی نـاویٚکی نـویٚ دەدا بـۆ ناونـانی شـار و دیٚ : ئیسـلام ئابـاد ؛ جـەلال ئابـاد ؛ عەشق ئاباد ...

٢ ـ لە کوردیدا :

ا ) بـە زۆری بـە هـەمان چەشـنی زمانـانی خزمـی ، خۆی دەنویٚنیٚ : مەهاباد...

ب ) بـە تـەنیاش لـە شـیٚوەی ئاوەڵنـاوی سـادەدا بەکاردەبریٚ . ئەوەتە مامۆستا هیٚمن دەڵیٚ :

وەك بەهەشت خەمڵیوە خاکی پاکی کوردستانی ئازاد

موڵکی ئازەربایجانیش بۆتەوە مەعموور و ئاباد

**بازاڕ :**

فارسیی کۆن : ئەبا جاڕی

پەهلەوی : ڤاچاڕ

(ڤ)ی پەهلەوی لە کوردیدا بووە بە (ب)و

(چ)ش بووە بە (ز) :

ڤاچاڕ > بازاڕ

(ئەبا)ی فارسیی کۆن لە سانسکریتیدا (سەبهە)یە ، کە واتای (شوێنی کۆبوونەوە) دەگەیەنێ.

کەرتی دووەمی لە چاوگی (جەڕی)یەوەیە ، کە واتای (لەوەڕان) دەدات .

وا پێدەچی وشەی (شار)یش هەر لە (زاڕ) - (چاڕ) =(جار)ی‌یەوە کوتبێتەوە . ئەوەتە لە دیالێکتی ژووروی کوردیدا بە (شار) دەوترێ (باژێڕ) .

**ئارەزوو :**

- ئارزوو ، ئارەزۆ ، ئارزی ، واز ، حەز...

ئاوێستا : ئازی

پەهلەوی : ئارزۆك ، ئارزووك ، ئاهووك

سانسکریتی : ئازەڤ

## تێبینی :

١ . لە ئاوێستا و پەهلەوی و سانسکریتی و گشت دیالێکت و بەشە دیالێکتەکانی کوردیدا (ئا)ی سەرەتای وشەکە وەك یەکە و هیچ گۆڕانێکی بەسەردا نەهاتووە .

٢ . لە پەهلەوی و کوردیدا :

أ ) لە نێوان (ئا)و (ز)دا (ر) پەیدابووە .

ب ) دەنگی (ی) بووە بە (وو) ، یان (ۆ).

٣. لە هەندێ شێوەی کوردیدا (ی) کۆتایی وەك خۆی ماوەتەوە . (ئارزی).

## ئادەم :

بە (عیبریی کۆن) واتای (مرۆ ، مرۆڤ ، مەردووم ، ئینسان ، بەشەر) دەدات .

ئادەمیزاد =

ئادەم + ی + زاد (نەوە)

واتە ـ ئەو کەسانەی لە ئادەم کەوتوونەتەوە .

## ئەبەنووس :

= ئابەنووس ، ئابنووس ...

لە وشـەی (EBENOS)ی گریکـی‌یـەوە وەرگـیراوە ،
کە واتای (داری ڕەش) دەگەیەنیٚ.

فارسی : ابنوس

## ئارام :

- ئۆخـژن ، ئۆقــرە ... ســرەوت ، ســەبر ... تــوان ،
توانست ... وزە ، هێز ... لەسەرخۆ ، هێمن ... خامۆش،
بیٚدەنگ ... بەئەسپایی ، بەنەرمی ...

ئاوێستا : ئارەم

(ئا) پێشگرە بۆ جەخت کردن + (رەم) قەدی چاوکی
(حەسانەوە)یە .

سانسکریتی : رامەیەتی

فارسی : ارام

*(ئارەم)ی ئاوێستا چ لە کوردی و چ لە فارسیدا تەنیا
دەنگی (ە)ی گۆڕراوە بە (ا) .

## ئەژدیها :

= ئەژدەها ، هەژدەها ، هەژدیها...

ئاوێستا : ئەژی‌دەهاکە . پێکهاتووە لە :

(ئەژی) = مار

(دەھ) =ژەهراوی ، گەزندە ، ئازاردەکە

(اکە) - خراپ

ئەگەر لەگەڵ (ئەژدەها)ی کوردیدا بەراوردی بکەین ، دەبینین (ی)ی (ئەژی) و (کە)ی کۆتایی تێداچوون .

## ئاهەنگ :

- بەزم ، شایی ، گۆڤەند ،ڕابواردن ، خۆشی...

ئاوێستا : ئاتەنگ

پەهلەوی : ئاهەنگ

لەم وشەیەدا تەنیا دەنگی (ت) گۆڕاوە بە (ھ)

## ئازووخە :

- ئازۆخە ، ئازووقە ، تفاق ، زەخیرە...

ئاوێستا : ئازووئیتی ، ئازووتی - چەوری ، خواردەمەنی

## ئاخەلێوە :

- خاکەلێوە ، ئاخلێڤە

یەکەم مانگی بەهار ، سەرەتای بەهار

ئاخ - خاك

واته كاتێ شینایی به ئاستەم سەردەردێنێ و لەو سەردەمەدا ، كە ئاژەڵ دەلەوەڕێ ، خۆڵ و گیا پێكەوە هەڵدەگرێ ، ئاخ (=خاك) بە لێویەوە دیارە .

## ئاران :

له كوردیدا بەم مانایانە دێت :

١. زستانەوار ، گەرمەسێر ، قشلاخ...

٢. لەوەڕگا... مێرك... پاوان...

٣. دەشت ، تەختانی ، تەختایی...

٤. گۆشتەزەوی ، نەرمان...

٥. چۆڵ... هەرد... سارا...

## تێبینی :

به زمانی لاتینی (ئارێنا) بە واتای حەرفی (خۆڵ) دەگەیەنێ . لە ڕۆمای كۆن گۆڕەپانێكی دائیری یان هێلكەئاسایی خۆڵ بەسەردا ڕاخراو له ناوەندی (ئامفی تیاتر)ی بینای بینەراندا بۆ نیشاندان و بەگژ یەكدا كردنی كۆیلە و ئەسیری جەنگ و گیانلەبەری دڕندە بەكاردەهێنرا . (ئارێنا)ی لاتینی لە فەرەنسیدا بووە بە (ئارێن) و له ڕووسیدا (ئەرێنە) .

### مێش :

= مەشی ؛ مەگەز

ئاوێستا : مەخشی

پەهلەوی : مەگەس ، مەکەس

* وا پێدەچێ (مێش ، مەشی) لە (مەخشی) ئاوێستاوە کەوتبنەوە و (مەگەز)یش لە (مەگەس ، مەکەس)ی پەهلەوییەوە.

### ماسی :

= ماهی

ئاوێستا : مەسیە

پەهلەوی : ماهیك

بلووجی : ماهی

ئەفغانی : ماهەی

سانسکریتی : مەتسیە

### گەروو :

= ئەوك ، قورگ

ئاوێستا : گەرەه

پەهلەوی : گەرووك

فارسیی نویّ : گلّوو

سانسکریتی : گەله

لاتینی : گولّه

ئەرمەنی : کول

ئەفغانی : گارە ، غارە

ڕووسی : گۆرڵە

کەنی :

= کەنیشك ، کیژ ، کناچە ، کناچی ، کچ...

ئاوێستا : کەنیا ، کەینین ، کەینیکا

پەهلەوی : کەنیك

سانسکریتی : کەنیە

نەمر :

= زیندوو

پێکهاتووه لە ئامرازی (نە)ی نەریّ + (مر)ی ڕەگی کرداری (مردن) .

ئاوێستا : ئەمرتە

پێکهاتووه لە ئامرازی (ئە)ی نەرێ + (مرتە) ، کە قەدێکە واتای (مەرد) یان (مردوو) دەدات .

**ئەفسەر :**

- زابت ، زاووت

ئەم وشەیە لە ڕێی زمانی فارسییەوە هاتووەتە کوردییەوە .

لە (ئەفیسێر)ی ڕووسی و(ئوفیسیە)ی فەرەنسی و (ئۆفیسەر)ی ئینگلیزی ... وەرگیراوە . ئەوانیش لە ( ئۆفیسیووم)ی لاتینییەوە بە مانای (فەرمانبەری گشتی)یان وەرگرتووە.

**بەفر :**

کرمانجی ژووروو : بەرف

ئاوێستا : ڤەفرە

پەهلەوی : ڤەرف

فارسیی نوێ : بەرف

**تێبینی :**

١. دەنگی (ڤ)ی ئاوێستا و پەهلەوی لە گەڵ وشەی کوردیدا بووەتە (ب) .

٢. (بەفر)ی كرمانجیی خواروو دەچێتەوە سەر ئاوێستا و (بەرف)ی كـرمانجی ژووروو و فارسی دەچێتەوە سەر پەهلەوی .

## ئینجیل :

یۆنانی : ئێڤانگێلیۆن

- مزگێنی ؛ خەبەری خۆش

## ئیبلیس :

عەرەب لە یۆنانییەوە وەری‌گرتووە (دیابۆلۆس) بە یۆنانی واتای (درۆزن ، دووزمان) دەگەیەنێ .

## ئەسرین :

- فرمێسك ، ئەسر ، ئەسروو

ئاوێستا : ئەسرەڤ ، ئەسروو

پەهلەوی : ئەرس

## تێبینی :

١ . لە هەندێ شوێنی كـــوردستان (ئەسروو) دەوترێ كە ئەمە تەواو لەگەڵ ئاوێستاكەدا یەك دەگرنەوە .

٢. لــه (ئەســر)ی هــەندێ هــەرێمی کوردەواریــدا تێداچوونی (ەڤ) یان (وو)ی کۆتایی دەبینرێ.

٣. بۆ (ئەسرین)یش وا پێدەچێ (ەڤ) یان (وو) بووە بە (ین).

## ئەمبار :

- عەمبار...

ئاوێستا : هام پەر

پەهلەوی : هەنبار

(هامپەر)ی ئاوێستای بە مانای (ئاخنین ، پڕکردن و داگرتن) دێت .

- وا پێدەچێــێ عــەرەب لــە زمانــە هینــد و ئەوروپاییەکانەوە وەریان گرتبێ .

## بەگ :

ئاوێستا : بەغە ، بەگە ، خوا

پەهلەوی : بەگ - خوا

عەرەبی و فارسیی : بێگ

تێبینی :

١. لە کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیدا ماناکەی گۆڕاوە.

٢. قاڵبە کوردییەکەی بەتەواوی وەك پەهلەوی یە. هەرچی فارسی و عەرەبی و تورکی یەکەیە، جیاوازییان لەگەڵ پەهلەوی یەکەدا هەیە.

٣. لە زمانی ڕووسیدا (بۆگ) بەمانای (خوا) دێت .

بووم :

= زەوی ، خاك

ئاوێستا : بوومی

پەهلەوی : بووم

سانسکریتی : بهوومی

وشەی (بووم) لە کوردیدا لە بیرچووەتەوە و بەتەنیا بەکار نایەت . ئێستا تەنیا لە دوو وشەی (بوومەلەرزە) و ( بەروبووم)دا دەبینرێ .

### مردن :

ئاوێستا : مەر

فارسیی کۆن : مەر

سانسکریتی : مەر

پەهلەوی : مورتەن

بلووجی : میرەگ

فارسی : مورده

*(موت)ی عەرەبی لە (مورتەن)ی پەهلەوییەوە نێزیکە. واتە عەرەبییەکە لە دەنگی یەکەم . (م)و دووەم . (و)و سێیەم ـ (ت)ی پەهلەوی پێکهاتووە.

### ژیان :

ئاوێستا : زیانی ، زیانا ، جیانو

سانسکریتی : جیەنە

پەهلەوی : جان

فارسی : جان

ئەفغانی : زیان

بلووجی : زیانی

ئەرمەنی : زیەن

ڕووسی : ژیزن

*تەنیا لە کوردی و ڕووسیدا دەنگی یەکەم بووە
بە (ڤ).

## ئامین :

بنجی ئەم وشەیە عیبریی کۆنە و دەقاودەق واتای
(ڕاستە ، وایە ، تەواوە...) دەگەیەنێ .

## ئوتوو :

کوردی ئـــەم وشـــەیەی لـــە زمـــانی ڕووســـیـیەوە
وەرگرتووە.

بە ڕووسی (ئوتیووك)ی پێدەوترێ.

ڕووسیش لە تەتەری وەرگرتووە .

بە تەتەری (ئەتەك)ە .

## سەماوەر :

وشەیێکی ڕەسەنی ڕووسیـیە ، کە پێکهاتووە لە :

(سام + ە + ڤار)

(سام) - خۆ

(ە) = ناوبەندە (سام) و (ڤار)ی بەیەکەوە بەستووە.

(ڤار)- ڕەگی کرداری (ڤاریت)ە - کوڵ . کوڵان

کەواتــە (ســەماوەر) دەقــاودەق واتــای (خۆکــوڵ ، خۆکوڵێن) دەگەیەنێ.

## هەشت :

- ئەشت

ئاوێستا - ئەشتە

پەهلەوی - ئەشت ، هەشت

سانسکریتی - ئەشتەو

*شێوەکانی ئـەم وشـەیەی کـوردی بەتـەواوی لەگەڵ شێوەکانی پەهلەویدا یەك دەگرنەوە.

## هەشتا :

- ئەشتا

ئاوێستا : ئەشتایتی

پەهلەوی : ئەشتات ، هەشتات

فارسی : هشتاد

بلووجی : هەشتاد

*وشەی (ئەشتاتی) ئاوێستا ، کە بە یاریدەی پاشگری (تـی) سازبووە ، وا پێدەچـێ لـە زمـانی پەهلـەویدا (ات)ی ئێرانی وەرگرتبـێ : (ئەشـتات .

هەشتات) . لە زمانی فارسی و بلووجیدا (ت)ەکە بووە بە (د) . (هەشتاد) . لە زمانی کوردیدا (ت) تێداچووە و (ا) ماوەتەوە و وشەکە بووە بە (ئەشتا ، هەشتا).

## بۆسۆ :

لە دوو مۆرفێم پێکهاتووە :

١. بۆ - بۆن ، بێن ، بێهن

ئاوێستا : بەئۆذی

پەهلەوی : بۆذ ، بۆی

گەرچی ئەم وشانە لە ئاوێستا و پەهلەویدا هەر بە بۆنی خۆش وتراوە ، بەڵام ئەمڕۆ لە کوردیدا بە هی خۆشیش و ناخۆشیش دەوترێ.

٢. سۆ (سووتان) - ئاگرتێبەربوون

**تێبینی :**

١. لە ناوچەی هەولێر دەوترێ : (بۆنسۆ) ؛ لە کرمانجی ژووروودا : (بۆسی).

٢. واتاکەی : بۆنی لۆکە و پەڕۆی سووتاو بەڵام بە (بۆنی چێشتێ ، کە بە بنی مەنجەڵەوە سووتابێ و لە کاتی خواردنیدا هەستی

پێبکرێ... یاخود تامی ماستێك شیرەکەی زۆر کوڵابێ...) دەوترێ : (بۆکن ... (بۆنی سووتانی هەندێ شت ، کە لە گیانداران دەکەونەوە ، وەك: خوری ، موو...)ش دەوترێ : (بۆکرووز ، بۆپروون).

## ئاخوڕ :

ئاوێستا : ئا ـ کوەرە

پەهلەوی : ئاخوەر

فارسی : اخور

لە کوردیدا ئەم وشانەش : (ئافر ، ئافڕ ، ئافەرە، ئاووڕ ، ئاهویر ، ئاڵفدان ، ئاخۆڕ ، ئاخڵ ، ئاخڵە ، هەڤش...) هاوواتاین .

قوش قوشی ڕاوی نەبێ ، مورغی کولانە و ئاخورە
سەگ سەگی تازی نەبێ ، کادینی‌یو ئەنبارییە
(نالی)

مەیتەر و زین و تەویلە ، ئەی برا لازم نییە
ئاخوڕ و ڕەشمە و لغاوی هەروەها پێویست نییە
(بێکەس)

## ئیدیۆم :

ئاخوڕی بەرزە =

بە یەکێك دەوترێ لووت بەرز و بە فیز بێت .

ئاخوڕی خوارە -

١. بە کەسێکی دەستبڕ و تەڵەکەباز و ناپاك دەوترێ.

٢. کاری چەوت و چەوێڵ و چەواشە .

٣. مرۆی دووڕوو و دووزمان .

ئاخوڕی خۆی لێ تێك چووە -

لە خۆی بایی بووە . لە خۆی گۆڕاوە .

ئاخوڕی چەورە -

بە کەسێك دەوترێ ساماندار و تێروتەسەل و سایە چەور بێت .

## ئازا :

ئاوێستا : ئەزامی

فارسی : شجاع

لە کوردیدا ئەم وشانەش (بوێر ، بەجەرگ ، جەمێر ، جوامێر ، دلاوەر ، دلێر ، گەڕناس ،

نـــەترس ، ئـــەگیت ، مێرخـــاس ، مـــەرد ...)
هـاوواتاین .

نییە دەخلَم لە شانامە و مەصافی ، غەیری ئەم نوکتە
کـە کـوشتەی بەندی تۆیە هەر کەسیٚ ئازاد و ئازا بیٚ
(نالی)
لـە پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ و شێری ئـازا بـوو
ئەمێستا مار و مێروو ، گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران
(حاجی قادری کۆیی)

(ئـازا) بـە مـانای نـاڕاستەوخۆش بەکـاردێنریٚ ، کە واتـای (چاپووك ، چالاك ، چوسـت ، بـەتاو ، بـەگوڕ ، خۆشـڕەو ، خـێرا ، گـورج ، تونـد ، پتـەو، پـەیت ...) دەگەیەنیٚ .

بەرانبەر ئەم واتایەی لە ئاوێستادا : (ئازوو ، ئاسوو) هەیە .

## ئیدیۆم :

ئازا گۆ و ئـازا مـەیدان = واتـا هـەی لـە گوتنـدا ئـازا ، ئەوە مەیدان ... بۆ هاندانی یەکێك دەوترێت ، کە بە قسە تەواوبێت و لە کرداردا سست بێت .

## ئاراستە :

لە زمـانی کوردیــدا وەك دوو وشــەی هــاوبێژ خــۆی دەنوێنێ :

١ . لـــە پەهلـــەویدا : (ئاراتـــەك)ە و چاوگەکەشـــی (ئاراستەن)ە و لە کوردیدا بووە بە (ڕازاندنەوە). واتە:

أ) خەمڵاوە ، جوانکراو ، ڕازاوە ، ئارایش کراو...

ب) تەکوزکراو ، ڕێکوپێك کراو ، لەبار...

ج) بە سـەروبەر ، ئامادەکراو ، سـازکراو ، ڕێکخـراو... (سوپا و ئووردوو و لەشکر).

د) ئامادە ، دەردەست ، ساز ، تەیار ، حازر

٢. بە واتای (ڕووبەڕوو) :

ئاراستەی قەدیم یەد قودرەتم
نەزدیك وە لیقای زات وەحدەتم
(میرزا ئولقادر)

## ئارد :

پەهلەوی : ئارت

فارسی : ارد

لە کوردیدا (ئار ، هارد ، ئەرڤان...)یش هاوواتاین.

پیرێژن ئەڵێ : بەفر ئارد بووە
قەدریان نەگرتووە و لە کیسیان چووە
(پیرەمێرد)

## ئیدیۆم :

ئاردی بێژراوە = شتی پوختەکراو ، سازکراو،خەمڵاوە

**پەندی پێشینان :**

ئاردی بێژراوە ، کەپەکی ماوە - واتە باشی ڕۆیوە و خراپی ماوە.

ئاردی ڕۆیوە و سۆسی ماوە - بە شتێك دەوترێ ، کە کەڵکی نەمابێ.

## ئار :

لە زمانی کوردیدا (ئار) وەك چوار وشەی هاوبێژ دەبینرێ :

١ـ بە واتای (ئاگر) :

ئەگەر بە ئاری عەشقەکەت دولبەر بسووتێم دوور نییە
چونکە وەك پەروانە قوربان من پەشێو ئەحواڵی تۆم
(مینە جاف)

مەمێ گۆت : برا ، دلێ من ژ کول و کەسەران وسا تژییە وێ ب ژانە

ژ دلێ من ئارێ حەفت فرنانە

(مەمێ ئالان)

٢ـ لە کرمانجیی ژووروودا بە مانای (ئارد) لە کاردایە:

ئاشڤانچی گۆت : جی هەیە ، لێ نان ل جەم من تونە ، ل ڤرا بوو بە خەلایی ، کەسەك نان نایینە ، ناهێرە ، ئاری من تونە ، کو ژ تەرا نانەکی بپیژم ...

(کوردۆ)

دەوترێ : ئارێ گەنم ؛ ئارێ جەھ ، ئارێ ب کەپەك

٣ـ لە دیالێکتی ژووروودا بە واتای (شەرم) بە کاردەبرێ ، کە ئەویش لە (عار)ی عەرەبییەوە کراوە بە (ئار) :

شکاند سۆندا خوە و ناڤێ خوەکر دەفتەرا دەرەوینانە

دناڤ خەلکێ دە،ب مە ڤە نەهشت ئار و فەدی تاڤا پوویانە

(مەمێ ئالان)

٤ـ لە هەندێ ناوچە بە مانای (نزار ، نسار ، نسێ ، سێبەر ...) دێت ـ واتە جێگەیێك لە بەرزیی شاخ و کێودا ، کە بەر سێبەرە و هەتاو کەم لێی دەدا ... شوێنێك کە هەتاو نایگرێتەوە .

## ئارا :

دەتوانین چوار وشەی (ئارا)ی هاوبێژ دیاری بکەین :

١ـ به ماناى (ڕازاندنەوە ، جوان کردن ، ڕێکخستن ...
ئـارایش ، ڕازاوە ، ڕێکوپێـك ...) ، کـە لـە فارسـیدا
(اراستن)ە .

تەخت ئارا - تەخت ڕازاندنەوە :

تا (سولەیمانان) نەبوونە صەدری تەختی ئاخیرەت
(ئەحمەد موختار)ی ئێمە شاهی تەخت ئارا نەبوو
(نالی)

چەمەن ئارا - چەمەن ڕازێنەوە :

تا نەگریا ئاسمان و ، تەم ولاتی دانەگرت
گوڵ چەمەن ئارا نەبوو ، هەم لێوی غونچە وا نەبوو
(نالی)

شەو ئارا - شەو ڕازێنەوە :

من و یەك لەحظە شەو ئارام و تاقەت
لە دووری ماهی شەوئارا ؟ فەرموو
(وەفایی)

بەزم ئارا :

من چۆن پەروانان هەر جانفدای تۆم
حەیران جەمین بەزم ئارای تۆم
(وەلی دێوانە)

٢ـ بە واتای (نێوان ، بەین ، ناوان ، مەیدان ...)

ئەوەی دامنا و بە هیوای بووم ، لە بیری کۆنی گەنجیدا
ئەوەی هێـزی خەیاڵاتم دروستی کـرد لە ئارادا
(ئیحسان فوئاد)

٣ـ بە مانای (ڕا ، بیر ، هزر ... بیروڕا و بۆچوونی کەسێك سەبارەت کێشەیێك ...). لە (أراء)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە ، کە کۆی (رأی)یە .

٤ـ لە شێوەی دملکیدا بە واتای (ئەوجار) دێت.

## ئارۆ :

لە شێوەی هەورامیدا بەکاردێ .

پێکهاتووە لە (ئا-ئەم) + (ڕۆ + ڕۆژ)

لە شێوەکانی دیی کوردیدا : (ئاڕۆ ، ئەمڕۆ ، ئەوڕۆ ، ئیمڕۆ ، ئبڕۆ ، ئەڤڕۆ ... ) هاوواتاین.

ئەی ڕەسوول ئارۆ شەوفش پەروازدا
وەناز و ئیعزاز کار تۆ ساز دا
(مەولەوی)

من واتم : درود مەوانە ئارۆ
هەر روکن و مەقام دوعای ویش دارۆ
(فەقێ قادری هەمەوەند)

ئارۆ قیبلۆ من ، بە لەنجە و لارە
تەشریفش وە لای ، تۆ ئامان هارە
(صەیدی هەورامی)

## ئیدیۆم

ئارۆ ، ئارۆن - ئەمڕۆ ئەمڕۆیە ـ واتە : ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە ، کە لێی دەترسای . ئەمڕۆ ڕۆژی منە .

## پەندی پێشینان :

ئارۆ سەوایش پەندکەرۆ - ئەمڕۆ سبەینێیی پێ دەکا.

## ئاد:

لە زمانی کوردیدا (ئاد) وەك سێ وشەی هاوبێژ خۆی دەنوێنێ :

١ـ لە ناوچەی هەورامان و هەندێ شوێنی دی کوردستان بە واتای (ئەو ـ بۆ نێرینە) دێت :

ئاد مارۆ بەویر تەرزەکەی باڵات

ئەو دیدەی مەستت ، ئێد خاڵ ئاڵات

(مەولەوی)

ماوای ڕەفیقش جە کۆی توون بێ

ئادیچ(١) چوون مەجنوون دەروون پڕ هوون بێ

(لەیلێ و مەجنوون)

ئاد دەماخ دڵ پەرداخ کەردەوە

ئێد سۆز یاران هەم ئاوەردە

(جەفایی)

---

(١)ئادیچ = ئەویش

## پەندی پێشینان :

ئاد سوار و من پیادە - ئەو سوار و من پیادە

ئاد کاروانچی و من خانچی - ئەو کاروانچی و من خانچی

ئەو + ان - ئەوان

لە هەورامیدا : ئاد + یشا - ئادیشا

لە ئاوێستادا : ئەیشام

٢ـ لە کرمانجیی ژووروودا بە واتای (بەڵێن ، پەیمان ، گفت ، سۆز... سوێند ، سۆند ، سووند...) بەکاردەبرێ، کە ئەویش لە (عهد)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە .

عەمەر بهیست سیرەتێ کالەمێرا

ئاد و قەرارێ جاهلی کوردا

(عەمەری جەلالی)

سۆندەك خورییە ، ئادەك پێرا ـ پەی ئەسەدێ ـ ئاغێ ، حەمزۆیێ

زەعڤارا گرێ نادەم کوفییا زێرا ، کل بەلەك چەعڤا

(ستران)

٣ـ بە واتای (دورگە)

لە فارسیدا : أداك

باڤی گۆت : لاوۆ ، گلی دکن ، کو ل ئۆرتا بەحرێ

ئادەك هەیە ، ل وێ ئادا پاشاك هەیە .

(کوردۆ)

## ئاخ :

وەك دوو وشەی هاوبێژ لە کاردایە

١ـ :

أ) بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت و کەسەر و پەژارە و بێزاری و ناڕەزایی و ناخۆشی و کڕووزانەوە .

لە ئاوێستادا : ئەختی

لە کوردیدا ئەم وشانە هاوواتاین = ئاخ ، ئۆف ، ئۆی ...

ئاخ چ دەردێکی گرانە بۆ گەلی کوردی هەژار
قەت بە دەم ناکریٚ بەیانی هێندە سەخت و کاری‌یە

(بێکەس)

ئۆف هەزار ئۆف هەزار ئاخ تا قیامەت ئاخ و داخ
من کە سنگم بەردە طەبعـم بەرزە چەشنی شاخ و داخ

(گۆران)

مەمیٚ گۆت : ئەز نەیٚرم تو میرەکی دینی
تو زەلامەکی فەقیری ، ژ چ ئاخ و کەسەران بەسەر دلیٚ خوەدا دکێشیٚ

(مەمیٚ ئالان)

ب) داخ ، مخابن ، حەیف ... حەیف و ئەسەف

خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت دەویٚ
ئاخ مەمی تیایە نەك بەری کەوی

(پیرەمێرد)

بێ تەوەر کریا خەتەنە سووران

ئاخ چەند بێوەفان ئی چەرخی دەوران

(لەیلێ و مەجنوون)

## ئیدیۆم :

**ئاخ ئو ئەمان - کڕووزانەوە لە دەست نەخۆشی**

**ئاخ ئو کەسەر - ئاخ و داخ لە تینی ماتەمی**

**ج) ئا ، ئاه ... خۆزگە و ئاواتخواستن :**

ئاخ ، خۆزگە هەڵئەفڕی ، ئەمزانی ئاخۆ

ڕاسپێریی چیی پێیە بۆ گیانی پەشێو

(گۆران)

ئاخ وێ کەنگێ بێ بەربانگ

ببە شەبەق و سبە

(شکۆی حەسەن)

## پەندی پێشینان :

**ئاخ زۆرە پەی زاتێ - خۆزگە ئەم هێزە زاتێکی لەگەڵدا دەبوو.**

**د) ئا ، ئای ... نکەنکی نەخۆش لە کاتی ئێش و ئازاردا ... هاوار لەبەر ئازار**

**هـ) ئۆی . بۆ سەرسوڕمان :**

ئاخ لەگەڵ ئێمە (حەبیبە) سەر و پەیوەندی نییە

نەی شەکەر قەددە ، بەڵا بەندی هەیە قەندی نییە

(نالی)

٢ـ لـه كرمـانجيى ژووروودا بـه مانـای (خـاك ، خۆڵ ، گڵ ، تـۆز ، ئـەرد ، هـەرد ، عـەرد ، ئـەرز ، عەرز ، زەوی ، زەمین ...) دێت :

ئاخا قەدەما موحتەرەما پایـی پـەر مە
وەك طوطی پەیاپەی ل زبان شەکەری مە

(جزیری)

ڕۆژەك ژ ڕۆژێن خوەدێ ، ئەمێ سەرێ خوە دەنین
دیارێ ڕەحمەتێ ئاخا گۆڕانە

(مەمێ ئالان)

## ئیدیۆم :

ئاخسـار - خـاکی سـارد و سـڕ . ئاسـوودەی هەمیشەیی . سارد و سڕیی گۆڕ.

ئاخ کـەفتن = چوونـە ژێـر گـڵ . لـه گـۆڕدا ڕاکشـان . مردن

ئاخێ گۆڕدا حنەکری = بە گڵی گۆڕ خەنەکراو

## تێبینی :

ئەمڕۆ وشەی (ئاخ) لە دیالێکتی خوارووی کوردیدا، تـەنیا لـە چـەند وشـەییێکی کـەمی ناسـادەی وەك (ئاخـەلێوە ، ئاخـەبان ، ئاخـەپوولکانێ ، ئاخـەباران ، بناخـە ...)دا بـەرچاو دەکـەوێ ، بـەڵام لـە دیـالێکتی

ژووروودا وێڕای بە تەنیا بەکارهێنانی (چ لە زوودا و چ ئەمڕۆ) لە چەندین وشەی لێکدراوی ، وەك (ئاخلێقە ، ئاخەبان ، ئاخەبانی ، ئاخپین ، ئاخچە ، ئاخپەرست ، ئاخکۆلك ...)یشدا بەدی دەکرێ .

## ئازاد :

ئاوێستا :ئازاتە

پەهلەوی : ئازات

واتاکانی :

١ـ ڕزگار ، سەربەست ، سەربەخۆ ... :

ا) یەکێك بەند و دیل و ئێخسیری یەکێکی دی ، یان شتێك نەبێ :

لە بەهەشتا بە یادی تۆ شادم

بە تەماشای فریشتە ئازادم

(پیرەمێرد)

د باغێ لەفظ و مەعنایێ

(سخن) من سەری ئازادە

(جزیری)

سا دەی وەجامێ دڵم بکەر شاد

وەکو بۆ یاروو بەزمی وە ئازاد

(مەولەوی)

ب) میللـەتێك یان وڵـاتێك لـە ژێـر دەسـتی بێگانـەدا نـەبێ و خـۆی حوکمـی خـۆی بکـا ، واتـە سـەربەخۆ بێ:

کاتێ جەژن ئەکەم بگەم بە مراد
میللەتم شاد بێت ، نیشتمان ئازاد
(بێکەس)

٢ـ ڕاهی ، سەربەست ، ئاواڵە ، ئاوەڵا ، واڵا ، وازە... :

أ) ئـافرەتێك ڕووی خـۆی دانەپۆشـێ و شـەرم لـە پیاوان نەکا .

ب)هـەر کەسـێك لـە هەڵسـوکەت و مامەڵـەی لەگـەڵ خەڵکیدا شەرم نەکا و واڵا و کراوە بێ .

٣ـ بێتاوان ، بێگوناه ، بێسووچ ، بێخەتا ...

## ئـازار :

لە زمـانی کوردیـدا چـوار وشـەی (ئـازار)ی هـاوبێژ دەبینرێ :

١ـ لە پەهلەویدا : ئازار

بەم مانایە :

أ) ئێـش ، ژان ، ئێـش و ژانـی ئـەندامی لـەش بـە هـۆی نەخۆشی و برینداریيەوە :

سەری کاکە مەمی دەگرت ، داینا لەسەر ڕانیە

دەڵێ : ڕۆڵە بە قوربانت بم کوێت دێشێ ئازارت چییە
ڕۆڵە چاکە بابت ئازارت بزانێ
(تحفەی مظفریة)

ب)جەزرەبــە ، ســزا ... ئێــش و ژانــی ئــەنجامی شــتێکی ئازاردەر، وەك : گەستن ؛ لێدان ، کەوتن ... :

ئەو کــوردانەی کــە چەند مــانگێ لــەوە پێــش لەشــکری ئێرانی ئازار و چەرمەسەرییێکی زۆریان دابوونێ ... .

(قەڵای دمدم)

دەم دەم کە دەکا زاری پڕ ئازاری بە غونچە
بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا دەمی نادا

(نالی)

ج) ئەزیەت ، ئەزێت ، عەزیــەت ، عــەزێت ، ڕەنــج ، تەقــەلا ، کۆشــش ، هــەوڵ ، وەزەن ... ئێــش و ژانێکــی مــرۆ پــاش کارکردن و ماندووبوون هەستی پێدەکا .

د) پەژارە ، خەم ، خەفەت ، تاڵــاو ، دەردیسەری ، ناخۆشــی ... ئێش و ژانی دەروونی :

کوشتەی نازی خۆت زۆر مەدە ئازار
زولفت نەبێتە پەرژینی ڕوخسار

(پیرەمێرد)

محنەت و جەورا حەبیبێ
قەهر و ئازارا ڕەقیبێ

(جزیری)

تێبینی :

زۆر جار لەگەڵ وشەی (ئازار)دا ، وشەی (ئێش ، ژان ، خەم ، دەرد ...) دێت و دەوترێت : (ئێش و ئازار ) ، (ژان و ئازار) ، (خەم و ئازار) ، (دەرد و ئازار) ... وەك :

نازانم چۆتە کام دێ ، کام هەوار
چۆن منی جێهێشت بە ئێش و ئازار
(بەختیار زێوەر)

ژان و ئازار پتر شاناویان بۆ ژنە هێنا ...
(ژانی گەل ، ل ١١)

لە دنیای بێبنی غەمدام ، سەرم سوڕماوە لەم کارە
کە دڵداری و شەرابی مەستی بۆ من دەرد و ئازارە
(ئیحسان فوئاد)

٢ــ بە واتای :

أ) ئاهۆ ، پەتا ، درم ... نەخۆشیی گیرۆ ؛ نەخۆشیی ئادەمیزاد کە زوو تەشەنە دەکا و خەڵك زۆر دەکوژێ ، وەك : کۆلێرا ، تاعوون ...

دەوترێ : ئازار کەوتووەتە وڵاتەوە

ب) قڕ ، دەرد ...

دەوترێ : مریشکەکان ئازاریان تێکەوتووە

٣ـ لە کرمانجیی ژووروودا بە واتای :

أ) گریە ، کورك ، کورکە ...

ب) پرتەوبۆڵە ، هاوار ، قیژە ...

٤ـ بە واتای (ئادار) ـ واتە مانگی مارت

بە عەرەبی (اذار)ە و لە سوریانییەوە وەریان گرتووە

هادار ، مارت ، مارس ... دەبنە هاوواتای

هەر ساڵێك لە ڕۆژی جێژندا ، لە بیست و یەکی ئازاریندا

مەجلیسی عەشیرەتی بەرۆدار لە دیوەخانی کۆدەبنەوە .

(قەڵای دمدم)

## ئاب :

فارسیی نوێ : اب

فارسیی کۆن : ئاپی

ئاوێستا : ئاپ

سانسکریتی: ئاپە

کوردی : ئاو ، ئاڤ

وشەی (ئاب) لە ئەدەبی کوردیی زوودا زۆر دەبینرێ :

سروشکم ئاب و دانەی نارە ، کێ دی

بە حەرمی داوەری بەم طەرزە تەرزە؟!

(نالی)

ئاگر د ئاب و گل دکت

قەلبان ژ قەلبان هل دکت

(جزیری)

ئابە ئەسرین - ئاوی ئەسرین ، ئاوی فرمێسك :

بە ئاب ئەسرین شەو زیندەداران

بە دوعای خوفیەی طاعەت گوزاران

(فەقێ قادری هەمەوەند)

ئاب تەڵا - ئاوی زێڕ :

ئۆسای هونەروەر تەختەی سیم و ساف

مونەققەش بە ئاب تەڵا بێ خیلاف

(لەیلێ و مەجنوون)

ئاب حەیات - ئاوی ژیان

(نالی) ئوستادەکی گەلێ چا بوو

حضری ئابی حەیاتی مەعنا بوو

(حاجی قادری کۆیی)

ژ عنایەت نەظەرێ (خاصە) کو هەر مەصرەع و بەیتەك

قەدەحێن ئابی حەیاتینە د شعرا مە لە بالەب

(جزیری)

ئابی حەیوان - ئاوی حەیات ، ئاوی ژیان :

هیجری ئەمڕۆ شەوقی دیداری بەسەردا کەوتووە

تەشنەیی دیداری تۆیە ئابی حەیوانی دەوێ

(کوردی)

زاری تۆ گوڵزارە خۆ ، بۆچ ئابی حەیوانی هەیە ؟
سەروی تۆ ئازادە ، بۆچ نارنج و ڕوممانی بەردەدا ؟

(وەفایی)

ئابی زەلال - ئاوی پاك :

ئافتابە و لەگەن چەتەڵای بێغەش
پڕ ئابی زەڵال چون شیری بۆنخۆش

(لەیلێ و مەجنوون)

...هتد .

(ئاب) ئێستا نە لە زمانی ئاخاوتن و نە لە زمانی نووسیندا بە تەنیا بەکارناهێنرێ ، بەڵام لە ڕۆنانی وشەی ناسادەدا بەشداری دەکات . بەوێنە : ئابڕوو؛ ئابخانە ، تیزاب .

(ئاب) بە واتای ناڕاستەوخۆش بەکاردێ ، بە تایبەت لەم حاڵەتانەدا :

أ) کاتێ پاشگری (ـ دار)ی دەخرێتە سەر واتای (بریسکە ، بریقە ، ورشە ، ڕەونەق) دەگەیەنێ:

یەمی دیدە پڕ لە مەرجان ، وەك یەشمی ئابدارە
شەبەیە شەبیهی زوڵفی سیاهی وەك زوخاڵی

(نالی)

دا بە کەمەر گاش شەمشیر ئابدار
دوو نیم بی خەطەر بەوێنەی خەیار

(فەقێ قادری هەمەوەند)

ب) دەمێ وشەی وەك (تاب ، ڕەنگ ...)ی بە دوادا

دێ ، واتای (ڕازاوە ، ڕەونەق) ڕادەگەیەنێ :

ئاب و تاب :

دولبەر ... بۆ جوانی پەردەی گوڵداری بە ئابوتابی بە نێو

ڕەشماڵدا گێڕابوو ...

(قەڵای دمدم)

ئاب و ڕەنگ :

بە ئاب و ڕەنگ و ڕوو حۆری ، بە زولف و کاکۆڵی غیلمان

گوڵاویان دا لە مەیخانە ، غوباریان عەنبەر ئاسا کرد.

(وەفایی)

## تێبینی :

هەرچی وشەی (ئاب) = هەشتەم مانگی ڕۆمی‌یە ،

بووەتە هاوبێژی (ئاب)ەکەی خۆمان .

ئەم بە لاتینی (AUGUSTUS)ی پێ دەوترێ و بە

ناوی(ئاوگوست)ی ئیمپراتۆری ڕۆمەوە ناونراوە ...

ئەو لە مانگی ئابدا لە دایك بووە ...

–ماوێتی –

# زمانی کوردی و
# خەوشی هەندێ وشە و زاراوەی نوێ



د. ئەورەحمانی حاجی مارف

- بەشی یەکەم -

بەغدا - ٢٠٠٠

# پێشەکی

ئێمە هەر لە منداڵییەوە لەگەڵ فێربوونی وشەکانی زماندا ، فێری ئەو یاسا و دەستوورانەش دەبین ، کە وشەیان پێ دروست دەکرێ و دادەڕێژرێ . ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆش و ئاسان دەکا ، لەتەك وەرگرتنی لە خۆڕا و میکانیکیی هەزاران وشەدا ، بتوانین بە بیر و هۆش لە زمان وردبینەوە و ، شتی شاراوەی ئاشکرا بکەین و فێری ئەوە ببین ، وەك چەکێکی پێویست بەکاری بێنین ...

زمان هەمیشە لە گەشەکردندایە و بە وشە و زاراوەی نوێ دەوڵەمەندتر دەبێ . ئاشکرایە ، کە بۆ ئەمە بە شێوەیێکی سەرەکی ، ئەو کەرەستەیە بەکاردەهێنرێ ، کە لەو زمانەدا هەیە. لە سەرێکەوە وشەی حازر بە دەست هەن و ، لە سەرێکی دییەوە کەرەستەی یاریدەدەر ، بەتایبەتی پێشگر و پاشگر و ڕەگ و قەدی کردار ... بەم چەشنە ، لەو

وشانەی لە زووەوە لە زماندا هەن ، وشەی نوێ ڕۆدەنرێ .

هەر کەسێك زمانی کوردی بزانێ ، بێ ئەوەی ئەرکێکی ئەوتۆ بکێشێ ، دەتوانێ چەندین وشەی نوێی وەها ناوبێنێ ، کە لەم سەردەمەی ئێمەدا پەیدا بوون . لەم قۆناغەدا ، کە ژیانی ڕووناکبیری و زانستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی ...ی میللەتی کورد لە برەودایە و تێکڕای جیهان لە پێشکەوتندایە ، بێگومان زمان پێویستی بە وشەی نوێ دەبێ و ڕۆژ بە ڕۆژ وشەی نوێ پەیدا دەبێ .

بەهرەی بوونی زمان ـ نیشانەی بەختەوەریی مەزنی ئادەمیزادە. خۆش ویستنی زمانی زگماك و باش زانینی و چاك بەکارهێنانی ... ئەرکی سەرشانی مرۆڤە و مایەی کامەرانیيەتی . ناسین و زانینی وشە و شارەزایی تێدا پەیداکردنی کارێکی بەرز و پێویستە .

من لەم زنجیرە وتارەدا هەوڵ دەدەم خەوش و نادروستیی هەندێ وشە و زاراوە و دەربڕین بگێڕمەوە و بیانخەمە سەر لەنگەری و بێژنگ و گێژ و تەتەڵەیان بکەم و گورگە و بنژێل و زێوانیان لێ بگرم ...
داوا و تکام لە هاوزمانانم ئەوەیە ، وا تێنەگەن بمەوێ

کوردی فێری کورد بکەم ، بەڵکو بە کوردی و بە کورتی نیاز و مەبەستم ئەوەیە ، هەر بە گفتی دەمی کورد ، گفتی نامۆ و نارەسەن ڕاست بکەمەوە :

* * *

زانکۆ :

سی ساڵێك لەمەوبەر کۆڕی زانیاری کورد زاراوەی (زانکۆ)ی دارشت و بێ چەند و چوون پەسەندکرا ... ئەمرۆ نەك تەنیا هەر سێ (جامعة)کەی کوردستان بە (زانکۆ) ناونراون ، بەڵکو لەسەر زاری هەموانیش بووەتە وشەیێکی ئاسایی و پتەو رەگی داکوتاوە و ، کەس گلەیی لەو هەڵە گەورەیە نییە ، کە نەك شوان و گاوانان ، بەڵکو زانایان لە رۆنانی ئەو زاراوەیەدا کردوویانە .

لە زمانی کوردیدا بۆ رۆنانی ناوی لێکدراو نزیکەی پازدە رێگەی جیاواز هەیە ، وەك:(ناو+ناو) ؛ (ناو+ناوبەند+ناو)؛ (ناو+ئاوەڵناو) ؛ (ئاوەڵناو+ناو) ؛ (ناو+رەگی کردار) ...

لە نێو ئەو رێگایانەدا ، یەکگرتنی (ناو و رەگی کردار زۆر باوە . وەك :

مەی + گێڕ (گێڕان) - مەیگێڕ

کۆڵ + گێڕ (گێڕان) - کۆڵگێڕ

کار + گێڕ (گێڕان) - کارگێڕ

...

دار + تاش (تاشین) - دارتاش

سەر + تاش (تاشین) - سەرتاش

بەرد + تاش (تاشین) - بەردتاش

...

شەکر + شکێن (شکاندن) - شەکرشکێن

سەر + شکێن (شکاندن) - سەرشکێن

سەفرا + شکێن (شکاندن) - سەفراشکێن

....

دەست + بڕ (بڕین) - دەست بڕ

قۆڵ + بڕ (بڕین) - قۆڵبڕ

سەر + بڕ (بڕین) - سەربڕ

... و دەیانی دی .

بەڵام ئەو ڕێگەیەی وشەی (زانکۆ)یان پێ ڕۆناوە ، واتە :

ڕەگی کردار + ناو

زان (زانین) + کۆ - زانکۆ

بە هیچ چەشنێك لە زمانی کوردیدا نییە ، لەبەر ئەوەی وشەی ناوبراو دژ بە یاساکانی ڕۆنانی وشەی لێکدراوی کوردی سازکراوە ، ئەوە دەچێتە خانەی هەڵەی زمانەوانییەوە .

جا کە هیچ یەکێك لەو وشانەی سەرەوە ، واتە : (مەیگێڕ ؛ (کۆڵگێڕ ؛ (کارگێڕ)...(دارتاش) ؛

(سەرتاش) ؛ (بەردتاش)... (شەكرشكێن) ؛ (سەرشكێن) ؛ (سەفراشكێن)... (دەستبڕ) ؛ (قوڵبڕ) ؛ (سەربڕ)... نەشێ بكرێن بە (گێرمەی) ؛ (گێڕكوڵ) ؛ (گێڕكار)... (تاشدار) ، (تاشسەر) ؛ (تاشبەرد)... (شكێنشەكر ) ؛ (شكێنسەر) ؛ (شكێنسەفرا)... (بڕدەست)؛ (بڕقوڵ)؛(بڕسەر)..ئەوە ڕاست نییە (زان)ی ڕەگی كرداری (زانین)یش پێش ناوەكە ـ (كۆ) بخرێت و ئەمە دەبێتە تێكدانی دەستوورە ڕەسەنە ڕێك و پێكەكانی زمانی كوردی.

بۆ زێدە ڕوونكردنەوە ، بەشێك لەو وشە لێكدراوانەی مۆرفێمی (زان) هاوبەشیی لە ڕۆنانیاندا كردووە ، دەخەمە بەرچاو و ئەوەتە لە سەرجەمیاندا ، كەوتووەتە دواوە :

كار + زان - كارزان

قسە + زان - قسەزان

یاری + زان - یاریزان

كوردی + زان - كوردیزان

ڕێ + زان - ڕێزان

زمان + زان - زمانزان

درۆ + زان - درۆزان

...هتد .

بێگومـان کـورد هـەرگیز نـەیوتووە : (زانکـار ؛ زانقسە؛ زان یـاری ؛ زانـکوردی ؛ زانـڕێ ؛ زانزمـان ؛ زان درۆ ... )...

کەواتـە لـە نێـو ئـەو هـەموو وشـانەدا (زانکـۆ) تاکـە وشەیەکە لە ساز و ئاوازی کوردییەوە دوور بێ ...

تێبینی :

١ـ لـە وشـەکانی (زانـا)؛(زانیـار)؛(زانیـاری)...دا مۆرفێمـی (زان) دەکەوێتـە پێشـەوە ، ئـەویش چونکـە ئـەو وشـانە داڕێـژراون ، نـەك لێکدراوـ واتـە لـە داڕێـژراودا پاشـگر بـە دوا ڕەگـدا دێـت ، بـەڵام لـە لێکدراودا ناو بەدوا ڕەگدا نایەت .

٢ـ وێڕای (نـاو) ، ئاوەڵکردار و ئاوەڵناویش لەگـەڵ (زان)دا دێن. وەك : زۆرزان ، کەمزان...

٣ ـ لە وشەکانی وەك : (کۆڕەو)و (کۆبەڕـ پوشـپەڕ، جەنگەی گیادروون)...دا (کۆ) لە سەردتاوە هـاتووە و ئەوجا ڕەگی کردارەکان ... ئەمانەش بۆیە هەڵەیان تێدا نەکراوە ، چونکە زانا و زمانەوان دایان نەناوە...بـەڵکو زادە و سەلیقەی خۆرسکی میللەت هێناونییە بەرهەم.

* * *

( سەرنج ڕاکێشەر) و ( سەرسوڕمێنەر ) و
( وشــەداڕێــژەر ) و ( هەڵـڕێـژەر ) و
( بـزوێنەر )

پاشگری (ـ ەر ) لـە زمـانی کوردیـدا لەگـەڵ ڕەگـی کرداری تێپەڕدا دێت و دەیکاتە ناوی کارا . بەوێنە :

| چاوگ | ڕەگ | پاشگر | ناوی کارا |
| --- | --- | --- | --- |
| خوێندن | خوێن | | خوێنەر |
| نووسین | نووس | | نووسەر |
| ئاخاوتن | ئاخێو | | ئاخێوەر |
| چاندن | چێن | | چێنەر |
| ناردن | نێر | ـەر | نێرەر |
| ... | | | |
| تێکۆشان | تێ ـ کۆش | | تێکۆشەر |
| داهێنان | دا ـ هێن | | داهێنەر |
| دانان | دا ـ نێ | | دانەر (١) |

پاشگری ( ـ ەر ) تەنیا لەگەڵ ڕەگی کرداری تێپەڕدا دێت و ناچێتە سەر ڕەگی کرداری تێنەپەڕ. پاشگرێکی زۆر چالاکە و بە بـەردەوامی لـە گەشەکردندایـە و بە

١) لەم حاڵەتەدا ، کە دوو بزوێن ـ واتە (ێ)ی کۆتایی ڕەگی کرداری (دان) و (ە)ی سەرەتای پێشگری (ـ ەر) بە یەك گەیشتوون ، (ێ)ی کۆتایی ڕەگ تێچووە و (ە)ی سەرەتای پاشگر ماوەتەوە .

تایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا بۆ دانان و ڕۆنانی زاراوەی هەمە جۆر کەڵکی زۆری لێوەرگیراوە .

پێویستە پەنجە بۆ ئەو ڕاستییە ڕابکێشین ، وشەی (خوێنەر ، نووسەر ... تێکۆشەر ، دانەر...)، کە بە نموونە هێناومانەتەوە لە تێکستی کۆنی کوردیدا نابینرێن و نوێباون و تا ڕادەیێك لە ڕۆنانیاندا لە دەستوور لادراوە. لادانەکەش ئەوەیە ، کە لە وشەی کۆنی کوردیدا پاشگری (ـ ەر) لەگەڵ ڕەگی کرداردا نەهاتووە ، بەڵکو چووەتە سەر ناو و ئاوەڵناو و ئاوەڵکردار . بەوێنە :

کۆچەر : کۆچ + ەر

سەنگەر : سەنگ + ەر

لەنگەر : لەنگ + ەر

چەپەر : چەپ + ەر

... هتد .

دانانی پاشگری (ـ ەر) لەگەڵ ڕەگی کرداردا ، ئەگەرچی ناچێتە نێو قاڵبی دەستووری بنەڕەتیی زمانی کوردییەوە و ئەو چەشنە بەکارهێنانە نوێیەش بە گەشەپێدان و فراوانکردنی سنووری بەکارهێنان و دەوڵەمەندکردنی زمان لە قەڵەم بدرێ ، یاخود بە پێچەوانەوە بە کارێکی نادروست و لادان بژمێررێ ،

هیچ لەو ڕاستی‌یە ناگۆڕێ ، کە دەیان وشە لە نووسین و ئاخاوتندا بە جۆرێك بنجیان داکوتاوە ، بڕیاری دەزگا زانستی‌یەکانیش ناتوانێ کاریان تێ‌بکا .

بێ‌گومان ڕەگی کردار بەتەنیا ناوی کارای لێ پەیدا نابێ . واتە : ((خوێن ، نووس ، ئاخێو ، چێن ، نێر ...)) ، کە ڕەگی ((خوێندن ، نووسین ، ئاخاوتن ، چاندن ، ناردن ...))ن نابنە ناوی کارا (٢)، بەڵام پاشگری (ـ ەر) کردوونی بە ناوی کارا . کاتێ لە پێش ڕەگی کردارەوە (جگە لە کرداری ((کردن ، بردن ، خستن ، دان ، نان )) پێشگر ، وەك (ب+وێر-بوێر) ؛ (نە+مر-نەمر) ؛ (ڕا+گر- ڕاگر) ، (هەڵ + ڕێژ - هەڵڕێژ)؛ (وەر + گێڕ- وەرگێڕ) ؛(تێ +بڕ- تێ‌بڕ) ؛ یاخود وشەیێك دێ ، وەك (خۆش+نووس-خۆش نووس) ؛ (پیاو+کوژ-پیاوکوژ) ؛ (پەیام+نێر=پەیام نێر) ؛ (دوور+بین-دووربین) ؛ (مەلا+بەزێن=مەلابەزێن) ؛ (خوێن+مژ-خوێن مژ ؛ (سەر+تاش-سەرتاش) ؛ (ئاو+کێش-ئاوکێش) ؛

---

٢) هەندێ لەو کردارانەی بە یاریدەی پاشگری (ـ اندن) تێپەڕکراون ، ڕەگیان ناوی کارا پێك دێنێ . وەك

| تێپەڕ | تێپەڕکراو | ڕەگ و ناوی کارا |
|---|---|---|
| بزووتن | بزواندن | بزوێن |

(کـەللە+تـەزێن+کـەلـلـەتەزێن)؛ (خـەم+ڕەوێـن=خـەم ڕەوێـن) ؛ (سـەرنج+ڕاکێـش=سـەرنج ڕاکێـش) ؛ (سەر+سوڕ+هێن=سەرسوڕهێن) ... لەبەر ئەوەی لە خودی خۆیاناوی کاران ، ناشێ پاشگری (ـ ەر)یان بخرێنە سەر (٢) . بەداخەوە زوربەی زۆری نووسەرانی

---

٢) هەرچی کرداری (خواردن)ە ، کە ڕەگەکەی (خۆ)یە ، دەمێ وشەیێك لە پێشی‌یەوە دێ لە شێوەی (خۆر)دا دەردەکەوێ ، وەك (زۆرخۆر . کەم خۆر ، نان خۆر ، سوێندخۆر ... ) . ئێمە وای بۆ دەچین ، کە هۆی ئەمە کارتی‌کردنی زمانی فارسی بێ ، چونکە قاڵبی ئەو کردارە لە فارسیدا (خوردن)ە و ڕەگەکەشی (خور)ە ... وێڕای ئەوە ، ئەوەش دێنینەوە یاد ، کە لە بەشە دیالێکتی سلێمانیدا هەندێ کردار لە ڕێژەی داخوازیدا دەنگی (ر) لە کۆتاییەوە پەیدا دەبێ ، وەك : (بچۆ- بچۆرە ؛ بڕۆ - بڕۆرە ؛ ببە - ببەرە ؛ بێ - بێرە ...)

مامۆستا ڕەفیق شوانی وای داناوە ، کە وشەی (خۆر) و (نان خۆر) لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا ناوی کاران و یەکەمیان لە (خۆ)ی ڕەگ و پاشگری (ـ ەر) پێکهاتووە و دووەمیشیان لە (نان)+(خۆ)+(ەر). بۆ ئیسپاتی ئەو ڕایەش پەنجەی بۆ لاپەڕە (٢٦٥)ی ژمارە (١٠٩)ی گۆڤاری ((ڕۆشنبیری نوێ)) ڕاکێشاوە ، کە مامۆستا فازیل عومەر ئەو باسەی تێدا کردووە . ڕاستی‌یەکەی (ـ ەر)ی وشەکانی (خۆر) و(نان خۆر) پاشگر نی‌یە و بۆ بەڵگەی ئەوەش لێرەدا تەنیا هێندە دەڵێم ، کە ڕەگی ئەو کردارە لە زمانی ئێرانیی کۆن و ئاوێستادا (خڤەر)ە و گۆڕینەوەی (ڤ) بە (و) یاساییکی ئاشکرای زمانە ئێرانی‌یەکانە . کرداری (خواردن)یش لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا لە قاڵبی (خوەرن)دا دەردەکەوێ و (خوەر)یش بنەماکەیەتی . بەوێنە لەو دیالێکتەدا دەوترێ : ((خوەرن گەند و گویە ، شوشتن ڕەنگ و بوویە)) .

کورد و تەنانەت زمانەوانان(٤)و کەڵەشاعیرانیش (ـ ەر)یان بە هەڵە ئیزافەکردووە و (هەڵڕێژەر) و (سەرنج ڕاکێشەر) و (سەرسوڕمێنەر) و (وشەداڕێژەر) و (بزوێنەر)...یان،لە بریتی (هەڵڕێژ) و (سەرنج ڕاکێش) و (سەرسوڕهێن) و (وشەداڕێژ) و (بزوێن).. بەکارهێناوە و بەکاردەهێنن... جا بەپێی ئەو ساز و ئاوازە نادروستە بێ ، دەبێ ئەو وشە جوان و ڕەسەنانەی سەرەوە بکرێن بە (خۆش نووسەر) و (سەرتاشەر) و(ئاوکێشەر)و(کەللەتەزێنەر) و (خەم ڕەوێنەر)... و بەمە بخرێنە نێو دەریای سەرگەردانی‌یەوە و وایان لێ بێ بۆ کەس قووت نەچن .

ئەگەر هەڵەی (هەڵڕێژەر) و (سەرنج ڕاکێشەر) تەنیا لە زیادکردنی پاشگری (ـ ەر)ەوە بێ ، ئەوە هەڵەی

---

٤) یەکێك لەو زمانەوانانە خۆمم ، کە تا چەند ساڵێکیش لەمەوبەر لە گەڵ نووسیندا ئەو هەڵـەیەم کردووە. هەڵەیێکی دی ئەو تەرزە ، ئەوەیە لە لاپەڕە (٣١)ی کتێبی ((وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا))دا زاراوەی (وشەداڕێژەر)م بەکارهێناوە ، کە ڕاستەکەی (وشەداڕێژ)ە . باش بوو هەستم بەو نادروستی‌یە کرد و ئەو چەوت و چەوێڵی‌یەشم وەلاوە نا ... نامەوێ لێرەدا هیما بۆ دەیان نووسینی ئەم چەند ساڵەی دوایی نووسەرانی ناسراو بکەم ، کە لەو جۆرە هەڵانە قوتار نەبوون و تەنیا هیوام وایە ، ئەوانیش ئەو ڕاستی‌یە لەبەرچاو بگرن .

(سەرسوڕمێنەر) ، وێڕای زیادیی پاشگری (ــ ەر) ، هەڵەیەکی دیشی تێدایە ، ئەویش لە دانانی (مێن)دایە ، کە ڕەگی کرداری (مان)ە . وەك پێشتر باسمان کرد ، پاشگری (ـ ەر) دەچێتە سەر کرداری تێپەڕ ، بەڵام (مان) تێنەپەڕە . جا ڕاست وایە ، کرداری (هێنان) ، کە تێپەڕە بکرێتە کەرەستەی ئەو ڕۆنانە و ئەو ئەرکە (هێن)ی ڕەگی بیبینێ و بوترێ : (سەرسوڕهێن) .

وەك پەنجەمان بۆ ڕاکێشا ، وشەی (دانەر...تێکۆشەر...) ، ئەگەر ڕۆنانیان دروستیش نەبێ ، دەرهاویشتنیان لە زمانی کوردی کارێکی ناهەموارە ... بە پێچەوانەشەوە وشەی وەك (سەرنج ڕاکێشەر ، سەرسوڕمێنەر...) لەبەر ئەوەی تەواو نامۆن ، لەگەڵ ئەو هەموو بەکارهێنانە زۆرەشدا هەر بێ شوێن و بێ لانەن و بە زۆرە ملێش جێیان نابێتەوە .

پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین ، پێنج کرداری (کردن ، بردن ، خستن ، دان ، نان) ، کە (کە ، بە ، خە ، دە ، نێ) دەبنە ڕەگیان ، ئەگەر وشەی واتادار لە پێشیانەوە بێ ، دەشێ پاشگری (ــ ەر) وەربگرن . وەك :

تەماشا + کە + ەر = تەماشاکەر

ڕاو + كە + ەر = ڕاوكەر (٥)

......

ڕێ + بە + ەر = ڕێبەر

پەیام + بە + ەر = پەیامبەر

......

پێش + خە + ەر = پێش خەر

سەر + خە + ەر = سەرخەر

......

هەواڵ + دە + ەر = هەواڵدەر

ڕەنج + دە + ەر = ڕەنجدەر

......

چێشت + لێ + نە + ەر = چێشت لێ نەر

پاڵ + نێ + ەر = پاڵ نەر

......

---

٥) ئەگەرچی تێكڕای نووسەرانی ڕێزمانی كوردی و نووسەری ئەم وتارەش (كەر)یان بە پاشگر لە قەڵەم داوە ، بەڵام دكتۆر ڕەفیق محەمەد شوانی ڕاست بۆ ئەوە چووە ، كە دەڵێ (كەر) لە (كە)ی ڕەگی چاوگی (كردن) و پاشگری (.ەر) پێكهاتووە (بڕوانە : نامەی ماجستێر ، ل ٧٤) . بێگومان تیشكی ڕووناكیی ئەو بۆچوونەی مامۆستا ڕەفیق ، ئەوەشمان نیشان دەدا ، كە (بەر) و (دەر) و (خەر) و (نەر)یش لە ڕەگی (بردن)و (دان) و (خستن) و (نان) و پاشگری (ـ ەر)ەوە پەیدابوون.

چوار ڕەگـی (کـە ، بـە ، خـە ، دە) ، کـە کۆتاییـان بــە بزوێنی (ە) هاتووە ، کـاتیٚ پاشـگری (ـ ەر) وەردەگـرن ، وەك یاسـایێکی گشـتیی فۆنـەتیکی کـوردی لــەو دوو (ە)یـە ــ واتـە (ە)ی کۆتـایی ڕەگـەکان و (ە)ی سـەرەتای پاشگرەکە ـ یەکێکیان تیٚدەچیٚ . هەرچی (نـیٚ)شـە ، کـە پاشگری (ـ ەر)ی پێـوە دەلکـیٚ (یٚ)ی کۆتـایی ڕەگەکـە نامێنیٚ و (ە)ی سەرەتای پاشگرەکە دەمێنێتەوە .

پێویسـتە پەنجە بۆ ئەوەش ڕابکێشین ، کـە جگـە لـە ڕەگی (نان) ، ڕەگی تێکڕای چوار کردارەکـەی دی ـ واتـە (کردن ، بردن ، خستن، دان) . دەتـوانــــریٚ بە یاریــدەی پێشگری (ب ـ) و پاشگری (ـ ەر) بکرێن بە ناوی کـارا .

بەوێنە :

| چاوگ | پێشگر | ڕەگ | پاشگر | ناوی کارا |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| کردن | | کە | | بکەر |
| بردن | بـ ـ | بە | ـ ەر | ببەر |
| خستن | | خە | | بخەر |
| دان | | دە | | بدەر |

* * *

## (ڕاناو) و (ڕاناواندن) و (پۆلێن کردن)

وشەی (ڕاناو) باش مەبەست ناپێکی و خوێنەر لە ماناکەی ڕادەمێنێ . چونکە :

بەشی یەکەمی ئەو زاراوەیە ـ بە گەلێ واتا دێ.

بەنموونە :

١ـ تەکبیر (بیروڕا) لە (رأی) عەرەبییەوە .

٢ـ ڕێ ، ڕێگە :

ڕابەر > ڕێبەر

(ڕا)ش پتر ڕێژە فارسییەکەیەتی و (ڕێ) کوردییە.

٣ـ وەك پێشگرێك دەچێنە سەر کردار :

هاتن ـ ڕاهاتن

کردن ـ ڕاکردن

گرتن ـ ڕاگرتن

ماڵین ـ ڕاماڵین

دان ـ ڕادان

هێنان ـ ڕاهێنان

بوون ـ ڕابوون

... هتد .

٤ـ ئەڕا - بۆچی

٥ـ وەك پاشبەندی (وە/ەوە) :

لە تۆوە - لە تۆڕا

له منەوە = لە منڕا

لە هەولێرەوە = لە هەولێرڕا

٦- جار ، کەڕەت :

ئەمڕا = ئەمجارە

٧- شیان (ڕات ناکەوێ)

و هەندێ واتای دی .

(ڕا) : کە ئەو هەموو مانایەی هەبێ ، هەڵبەت بۆ خوێنەر ئاسان نییە یەکسەر تێ بگا ، کە لە پێش وشەی (ناو)دا دابنرێ ، بزانێ کام مانایان مەبەستە .

لەگەڵ ئەوەدا ، کە (ڕا) ئەو هەموو مانایەی هەیە ، ئەوجاش واتای (جێ) ناگەیەنێ و مەبەستیش لەو زاراوەیە ، ئەوەیە (جێی‌ناو) بگرێتەوە.

شێوە ڕۆنانی ئەو زاراوەیە لە هەندێ زماندا بەم جۆرەیە :

یۆنانی : antonymia =(anto جێ) و (nymia - ناو)

لاتینی : pronomen = (pro - جێ) و (nomen - ناو)

ئینگلیزی : pronoun = (pro - جێ) و (noun - ناو)

ڕووسی: mes⁄toemenye = (mesto - جێ) و (emya ، ناو)

... هتد.

کەواتە (جێناو) لە گشت ڕوویەکەوە ، واتە بەپێی ڕوخسار و ناوەڕۆك لە (ڕاناو) ڕوونتر و ڕاستتر و تەواوتر و گونجاوتر و بەرفراوانترە ... :

١. (جێ) بەتەواوی لەگەڵ (anto)ی یۆنانی و (pro)ی لاتینی و ئینگلیزی و(mesto)ی ڕووسیدا یەك دەگرنەوە .

٢. لە دیالێکتی کرمانجیی ژووروودا بە کاری دێنن و بە پێی ئاوازی دەنگیی خۆیان ، کردوویانە بە (جیناڤ) . وێڕای ئەوە خەڵکی ئەو ناوچەیە لەم وشە لێکدراوە بە ئاسانی دەگەن و لە (ڕاناو) تێناگەن .

٣. (جێ) تەنیا یەك واتای هەیە ، کە ئەویش (شوێن)ە و واتاکەشی زۆر ئاسان و ڕوونە . واتە هەرچی (ڕا)یە مۆرفێمێکی فرەواتایە و زوربەی ماناکانیشی لێڵ و گرانن... وەك ئاشکرایە ، بۆ زاراوە وشەی یەك واتایی لە فرەواتایی پەسەندترە .

ئەو زاراوە نوێیانەی ئەمڕۆ لە زمانی بێگانەوە وەردەگیرێن ، پێویستە لە بە کوردی کردنیاندا لە ڕێ و ڕێبازی زمانەکەمان لانەدرێ . بە وشەی نابەجێ و ناقۆڵا یاسا و دەستوورەکانی نەشێوێنرێ ... ڕەنگە نابەڵەد و نەشارەزا بە نیازی ڕاژەی زمانەکەی ئەمەی لێ ڕوویدا و ئاکامی خزمەتەکەی ببێتە زەرەر و زیان ... بەڵام سەیر و سەمەرە ئەوەیە ، هەندێ زمانەوانانی کورد زاراوەی

ئـەوتۆ دادەڕێـژن ، کـە یـەکجارەکی ئـاواز و ئـاوەزی کوردایـەتی دەشـێوێنن . بەنموونـە چـەند مـانگێك لەمەوبـەر برایـەکی زمانـەوان بـۆ (pronominalzation) ــ (بەجێناوکـردن) ، زاراوەی (ڕانـاواندن)ی داڕشـتووە... وێڕای ئەوەی ژمارەییێك زمانـەوانانی کـورد گـەڵ ڕووی پاشگری (ـ اندن)یان ساخکردووەتەوە ، ئەمڕۆ تەنانـەت کۆلکـەخوێندەواری کوردیـش دەزانـێ ، وشـەکانی وەك (ژن ، پیاو، دەرگا ، پەنجـەرە ، ئاسمـان ، شـەقام... نـاو ، ڕاناو ...) بە تۆپزیش ئەو پاشگرە وەرناگرن ... ئێدی ئەو زمانەوانـە گاڵتـە بـە زمـانی زگمـاکی دەکـا ، یـان کـورد وتەنی ((لە بێ خەبەران کەشکەك سڵاوات)).

زاراوەی (ڕاناو) خۆی بارە بەسەر زمانی کوردییەوە ، کـەچی کـاکی زمـانـەوان پاشـگری (ــ انـدن ) یشـی خستووەتە سـەر... ئەمـە ئەو پەندە دێنێتـەوە یـاد ، کـە دەڵـێ ، (( ڕێـوی خـۆی نـەدەچوو بـە کونـەوە ، هەژگێکیشی بەستبوو بە گونەوە)) .

هەرچی زاراوەی (پۆلێن) و (پۆلێن کردن)ە و بەرانبەر (التصنیـف) بەکاری دەهێـنن ، دەتـوانم بڵێم یەکێکـە لـە زاراوە خراپ دروست کراوەکان... بەر لە هەر شت ، ئەوە دەزانین ، پاشگری (ـ ێن)، کە دەچێتە سەر ناو بە زۆری نـاوی یـاری پـەیدا دەبـێ ، وەك : (هـەڵماتێن ، تۆپێـن ،

